نشریه‌ی فرهنگی، ادبی، سیاسی و اجتماعی
دانشجویان دانشگاه ارومیه
سال هشتم، شماره‌ی چهاردهم، آذر ۱۳۹۹
کوردی_فارسی



کورته باسێک لەسەر چەپی کوردی

نفت ما را بیچاره کرد!

ڕوانینی پیاو و بەکاڵا کردنی مێینە

**نشریه‌ی فرهنگی، ادبی، سیاسی و اجتماعی**
**دانشجویان دانشگاه ارومیه**
**سال هشتم، شماره‌ی چهاردهم، آذر ۱۳۹۹**
**کوردی_فارسی**

**صاحب امتیاز:** فرشاد علی کرمی
**مدیر مسئول و سردبیر:** متین فرامرزپور





**متین فرامرزی:** ۰۹۳۹۲۶۷۷۵۳۰ — @jiwerjournal

# فهرست

# سەروتار

**بە ناوی خودای بەخشەندەو دلۆڤان.**

کە زریا ڕووباری نەبێ، دەنکی باران بۆ چییە،
تریشقەی هەورو لەپی زەوی، لانک نەبێ چییە.

بە هەموو گیر و گرفتەکانەوە هێشتاش ڕووگەیەک هەیە کە دڵ دەخوازێ ئیمانی پێ بێنێ. لەگەڵ هەموو ڕووداوەکان هەوارێک هەیە کە دەروون تەمەنناییەتی هاوارێ بۆ بەرێ. بە هەر هەنگاوێ دوورکەوتنەوە هەستێ سەودای پتر دەبێت بۆ نزیک بوونەوە لێی. کە کاتی گونجاو لێمان دیار نییە، هەر کاتێ گونجاوە بۆ گەڕانەوە. گەڕیانێک بە گریانەوە بۆ چوونە بەر هەر چاکییەک. چاکە نەناسراوە، بەڵام هەستی چاکە بە گومانەوە ڕەخساوە بۆ خاس بوون. دەستەوەستانی، هاوکاتە لەگەڵ ئیزنی خراپە دان. ڕێکەوتی ئەم هەنگاوە، هاوڕێیە لەگەڵ وەخۆ هاتنەوە. ئاگاداری ڕەنگە تەنیا وشەیەک بێت لێڵ و نادیار بۆ ئاگادارییەکی تر، بەڵام ویستی ئاگاداری ڕوونە وەک لەژیانا بوون. خوێندنەوەو گفت و گۆ لەسەر بیری وەرگیراو، باسی لەسەر باوەڕی وەدی هاتوو، کێشەیەک دێنێتەدی لەسەر بروا ڕاستەکانمان لەگەڵ بروا ڕاستەکانی کەسانی تر. کە کامیان ڕاستەو کام بەش لە کێهایان ڕاستە، دەکەوێتەوە بەردەنگی ناخی ڕاستی خوازمان. بەڵام ڕاست چی بووەو بەچیمان زانیوە، ڕەنگە دوور بێت لە زانستمان.

ئێمە وەک گۆڤاری خوێندکاری ژیوەر، ڕاستییەکانی خۆمان پێشکەشی ئێوە کردووە. ئەوە بەم مانایە نییە کە هەرچی ئێمە نەمان کتووە ڕاستی نییە، یان هەرچی وتوومانە ڕاستییە. هەر تاکمان ڕاستییەک کە بروامان پێی هەبووە نوسیومانە. کەواتە بڕواکان تایبەتە بە نووسەران. بەڵام ویستی هەرکاممان چاکە بووە. ئێوە ئەشێ بە چاوێکی ڕەخنەگرانەوە بابەتەکان بخوێننەوە، بڕواننە بڕاوی خۆتان و ئێمە، شەڕێک داگیرسێنن لەنێوان بڕواکان. بڕوای بڕاوە ڕەنگە ڕاست تر نەبێت، بەڵام بەهێزتر بۆ. کەواتە دەشبێ بڕوامان لە بێ هێزی دامالین و دارمالیان کەین لە هێزی چاکە.

هاوڕێی ئەم ژمارەیە لە ژیوەر بن.

مەتین فەرامەرزی
١٣٩٩/٩/٣٠

# چوار ژمارەی پێشووی ژیوەر:












# کورتە باسێک لەسەر چەپی کوردی

**هادی قادرنژاد**

عەداڵەت چەمکێکی فرەڕەهەند و فرەمانایە، بەو واتایە کە ئەو چەمکە لە قوتابخانە فکریەکان مانا و مەدلولی جیاواز بەرهەم دێنێ و ئەوەش بۆتە بەشێک لە ناکۆکیە فکریەکان لە سەردەمی ئێستا. ڕوون و ئاشکرایە چەمکە فکری و فەلسەفیەکان بە پێی هەل و مەرج و دۆخی بەستێن و کانتێکستەکان، مانای تایبەت بەخۆی بەرهەم هێناوە و هەوڵی داوە لە ڕێگەی دروست کردنی دەزگا و سیستەمێکی فکری و کۆنکرێتی چارەسەری کێشەکانی کۆمەڵگای خۆی پێ بکات. نکۆڵی لەوەی ناکرێ ڕێبەرانی سیاسی عەداڵەت خواز وەک مائۆتسەتۆن، ویلادیمیر لێنین و فیدێل کاسترۆ و زۆرانی‌تر بیرۆکەی مارکسیستیان هەبووە و لەژێر کاریگەری کارێڵ مارکس چەمکی «عەداڵەت»یان کردووە بە چەققی بیرکردنەوەیان. بەڵام ناتوانین ئەو فیڵە لە خۆمان بکەین و بڵێین هەر یەک لە مارکسیسمی ڕوسی، چینی و ئەمریکای لاتین بە یێک شێوە کارگێڕیان هەبووە و یەک خەتتی فکری و عەمەلیان کێشاوەتەوە. بێگومان بەستێنی سیاسی، کۆمەڵایەتی و کلتووری ئەو وڵاتانە لێکتر جیاوازن و هەر وڵاتە بەپێی بارودۆخێ تایبەت بەخۆی مامەڵەی لەگەڵ دەکرێ. چینی سەردەمی مائۆی، چینێکی پێش هاتنی سەرمایەداری بوو و بەشی زۆری خەڵک بە شێوەیەکی نەریتی دەژیا و ئابوریەکەشی لەسەر بنەمای کشت و کاڵ هەڵدەسوڕا، بۆیە مائۆ زۆرتر لەسەر هێزی «وەرزێڕ»ی وڵاتەکەی چڕ بۆوەو ئەوانی کرد بە جێبەجێکاری سەرەکی گۆڕانی مێژوویی وڵاتەکەی. کۆمۆنیستەکانی چین بە ڕێبەرایەتی مائۆ توانیان گەورەترین دوژمنی خۆیان و داگیرکەری وڵاتەکەیان واتا ژاپۆن ڕاو بنێن و لە وڵاتی خۆیان دەریان بکەن و کۆماری سوسیالیستی چین دابمەزرێنن و چین لە دەستێوەردانی بێگانە بپارێزن. هەروەها لە ڕوسیا کاتێک حیزبی بلشەویک خەباتی چینایەتی خۆی بە ڕێبەرایەتی لێنین دەست پێکرد، خەڵک بەدەستی تێزارەکان دەیاننالاند و لێنین بە لۆکالی کردنی تێئۆریەکانی مارکس فەزایەکی سیاسی تازەی لە وڵاتەکەی خۆی خوڵقاند و بوو بە ئیلهام بەخشی بەشێکی زۆر لە ڕوناکبیرە مارکسیستەکانی جیهان. دەمهەوێ بڵێم پرسی «عەداڵەت خوازی» بە پلەی یەکەم هاوکات بوو لەگەڵ ڕزگاری نیشتمانی، ئەگەر مائۆ دووبارە بە نموونە بێنینەوە دەبینین کە سوسیالیسم هاتە خزمەت نەتەوەی چین و یەکسانی خوازی بۆ ئەو نەتەوەیە بەرهەم هێنا، چینیەکان لێی بەهرەمەند بوون و پێی ڕزگار بوون [بەرانبەرکێ لەگەڵ ژاپۆنیەکان]. هەروەها لێنین باسی مافی نەتەوەکانی کرد لە دیاریکردنی چارەنووسی خۆیان و تەنانەت ئیجازەی جوێ بوونەوەی پێدان لە ئەگەری زوڵم و زۆرداری نەتەوەی باڵادەست بە سەر ژێردەست.

هاتنی ئەندێشەی چەپ [بە واتا مارکسیستیەکەی] بۆ ئێران دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی دەسهەڵاتداری قاجارەکان، بەڵام لەگەڵ هاتنەسەرکاری پەهلەویەکان بوو کە حیزبی کۆمۆنیستی ئێران و دواتریش حیزبی تودە بە فەرمی



دامەزران، گوتاری سەرەکی حیزبە چەپەکانی ئێران جیاواز لەوەی بە جل و بەرگی مارکسیستی داپۆشرابوون، هەروەک پێشتریش باسم لێکرد و نموونەمان بۆ هێناوە، لەسەر بنەمای بەرژەوەندی نەتەوەی ئێران و جوغرافیای سیاسی ئێران خۆی پێناسە کردووە. رەگەی «نەتەوەگەرایی ئێرانی» هەمیشە بوونی هەبووە لە هەناوی ئەو گوتارە و پاراستنی مەفهومی «ئێرانی فەرهەنگی» بە ئەرک و رەسالەتی خۆیان زانیوە. روناکبیرانی چەپی ئێرانی زۆر بە باشی لەو راستیە تێگەیشتوون کە مەفاهیم و تیئۆریەکان تەنێ کەڵک و ئُستفادەی موجەررەد و رووتیان نییە کە دەقاودەق و بێ دەستکاری وەرگێردرێنە سەر کۆمەڵگای ئێرانی. ئەوان نەهاتوون چوارچێوەی بنەرەتی دەوڵەت نەتەوەی ئێرانی تێک بدەن [کە باش دەزانن بەرهەمی زێهنیەتی ناسیونالیستی سەردەمی رەزا شای پەهلەویە] و بە پێی بریار و حەرەکەیەکی سیاسی بە جوغرافیای ئێران سەپاوە، واتا ئەوان دەزانن کە «ئێران» چەمکێکی سیاسیە و چەمکی «ئێرانی گەورەی فەرهەنگی» تەنیا فەنتازیا و خەیاڵێکە لە ناو زەینی پان ئێرانیەکان، بەلام وەک گریمانە و پێش مەرجێک بێ ئەوەی بۆ تەنیا جارێک گومانی لێ بکەن، پەسەند کراوە. مارکس لە شی کردنەوەی پەیوەندی نێوان ژێرخان و سەرخان [زیربنا و روبنا]، رۆڵی سەرەکی دەدات بە پەیوەندیەکانی بەرهەم هێنان و حەوزەکانی وەک سیاسەت، فەرهەنگ و فەلسەفە بە لێکەوتەی ئەو پەیوەندیانە دەزانێ، واتا ئەگەر کانتێکستی ئێران بە شێوەیەکی مارکسی بخوێنینەوە دەبێ چەمکی سیاسی «ئێران» و «فەرهەنگی ئێرانی» بە سەرخانی پەیوەندیە ئابوریەکانی قۆناغی سەرهەڵدانی پەهلەوی ببەستینەوە و بڵێین کە جوغرافیای سیاسی ئێران لێکەوتەیە و دەرەنجامی هەوڵ و ماندووبوونی بورژوازی ئێرانیە. کەوابوو دوبارە دەکرێ لە رێگەی دامەزراندنی ئابوریەکی سوسیالیستی مانا و چەمکی تازە لە سیاسەت و کلتوور بخولقێنین و ئەو تەقەددوسە لەسەر «تمامیت ارضی ایران» لابەین. بەلام هیچ کات نابینین چەپی ئێرانی [هەڵبەت ئەگەر بڵێین چەپی فارس رەنگە دەقیق تر بێ] پەردە لەسەر ئەو لێکەوتە سەرخانیە[روبنا] لابات و لە فۆرماسیۆنێکی تازە مەفهومی جوغرافیای سیاسی پێناسە بکات. چەپی مارکسیستی ئێرانی بە هەوای ناسیونالیسمی ئێرانی تەنەففوس دەکا و وەکوو پرەنسیپ و ئُستراتیژی قبوڵی کردووە، دروشمی «بەرابەری خەلقەکانی ئێران»یش لێرەدا لە بری ئەوەی مافی یەکسان بۆ گەلانی ئێران بەرهەم بێنێ زیاتر بەمەبەستی پەردەپۆش کردنی پرۆژەیەکی سیاسی بەکار دێت و ئامانجە سەرەکیەکان لە ژێر دەزگایەکی گوفتمانی دەشارێتەوە. لەو دەزگا گوفتمانییە چەن پێش مەرجێک دیاریکراوە؛ بۆ نموونە:

- هەموو ئەو گەلانەی لە ئێران دەژین، بە ئێرانی حیسابن و بەشێکن لە نەتەوەی گەورەی ئێرانی.
- «تمامیت ارضی ایران» هێڵی سورە و پێویستە یەکسانی



خوازی لەو ستراکتۆرە گەلان رزگار بکات و سیستەمی چینایەتی لە ناو ببات.

- هێزی دیاریکەر و چارەنوسساز «کرێکاری ئێرانیە» و هەر ئەو کرێکارەشە گۆرانکاری گەورە دروست دەکا و لە کۆتاییدا لەدەس سەرمایەداری رزگاری دێت.

لێرەدا چەپی مارکسیستی [بە هەموو لقەکانەوە] ئێرانی، خۆی، خستۆتە خزمەت نیشتمانی ئێران و بە پاراستنی سەرخانی بونیاد و ستراکتۆری داسەپاو (کە بەرهەمی رەوتە ناسیونالیستەکانن) درێژە بە ژیانی خۆی دەدا. رەنگە لێرەدا ئەو پرسیارە دروست بێ، گەلۆ مەگەر پێشتریش ئێمە نەمانکووت هەر وڵاتەی بۆ رزگاری و پێشکەوتنی رەهەندە جۆراوجۆرکانی کۆمەڵایەتی، سیاسی، ئابووری و کلتووری ئەندیشەی مارکسیستی بەکار هێناوە؟ ئەی بۆچی کە باسەکە گەیشتە جوغرافیای سیاسی ئێران هێندە مانۆوری دێتەسەر کە چەپەکان ستراکتۆرەکان دەپارێزن و هەوڵی بەرجەستە کردنەوەی مەفهومی «ئێرانی فەرهەنگی» دەدەن؟ رەنگە وڵامی ئەو پرسیارە پێویستی بە لێکدانەوەی زۆر هەبێ و لە روانگە و گۆشەنیگای جیاوازەوە شیکاری بوێ، بەلام ئەگەر لە دەلاقەی «پرسی نەتەوەکانی ئێرانەوە» چاوی لێ بکرێ دەبینین کە عەینیەت بەخشینی چەمکی ئێرانی فەرهەنگی و گریمانەگرتنی ئێرانی سیاسی، خۆی لە خۆیدا درێژەپێدان و بازتۆولیدی ناعەدالەتیە بە هەموو جۆرەکانیەوە:

- لە بواری پەیوەندیەکانی بەرهەم هێنانەوە، پەراوێزی ئێران دەبەستێتەوە بە ناوەندی ئێرانەوە، واتا دووبارە هەلاواردن لە ئاستی ناوچەکانی ئێران دروست دەبێت. سوسیالیسمی دەوڵەتی کە خاوەنی ئامرازی بەرهەم هێنانە و دژی «خاوەنداریتی تایبەت» [مالکیت خصوصی]یە، دەکەوێتە کۆنترۆڵی دەسەهەڵاتداران کە هاوکات پێداگرن لەسەر مێژویی بوونی ئێرانی فەرهەنگی. (خزمەت بە ناوچەکانی فارس نشین دەکات.)
- لە باری سیاسی و دام و دەزگای ئیداری و بە گشتی بۆروکراسی لە ئێران، بە حوکمی ئەوەی نەهادە حکومیەکان لە ناوەندی ئێران دامەزراون و جێگیر بوونە و مارکسیستی ئێرانی هەولی بۆ دیسێنترالیزە کردنی دەسەهەلات لە رێگەی بونیادنانی سیستەمێکی کۆنفێدێرالی [غەیری ناوەندی] نادات، نەتەوەکانی غەیری فارس بە جۆرێکیتر دەچەوسێنێتەوە و دیسان لە دەسەهەلاتی سیاسی بێبەش دەکرێن. یان باشتر بلێین «کۆمۆنیستە غەیرە فارسەکان» کە خاوەنی شوناس و حافیزەیەکی مێژوویی- ئانتۆلۆژی جیاوازن لە «سوسیالیسمی خۆماڵی و نیشتمانی» خۆیان دادەبرێن و پەیوەندیەکانی بالادەستیی فارسەکان بەسەر ژێردەستەیی غەیرە فارسەکان ئەوجار بە ناوی «دەوڵەتی سوسیالیستی ئێران» تۆکمەتر دەکرێن.
- لە باری کلتوری و بە تایبەت مەسەلەی زمان و خوێندن کە دەچێتە خانەی پەروەردەوە، مارکسیستە ئێرانیەکان

بەدیلێکی گونجاویان بۆ بەرەوڕووبوونەوە لەگەڵ ناسیونالیسمی فەرهەنگی نەتەوەکانی غەیرە فارس پێ نییە، لە حاڵێک دا کە نەتەوە غەیرە فارسەکان باس لە «خوێندن بە زمانی زگماکی» دەکەن و بە فەرمی ناسینی زمانەکەیان لە لایەن دەوڵەتی سوسیالیستی ئێرانیەوە بە لانیکەمی مافە رەوا و بەدیهیەکانی خۆیان دەزانن، لە باشترین حاڵەت دا مارکسیستە ئێرانیەکان تەنیا «خوێندنی زمانی زگماکی» بە رەوا دەزانن و لەوەی بترازێ مافێکی تر قائیل نین. ئیدی چۆن چارەسەری مەسەلەی شوناس خوازانەی نەتەوەکانی غەیرە فارس، وەک خەسارێک دەبینن بۆ چەسپاندنی سوسیالیسم، ئەوە دەبێ بۆخۆیان وڵام بدەنەوە؛ هەرچەن وڵامەکە لای ئێمە روونە و باش دەزانین ئەو بیرۆکەیە پاشماوەی بەجێماوی شۆڤینیزمی فارسیە کە لە فۆرمی چەپ دا سەری هەڵداوەتەوە.

بە پێچەوانەی رەخنەی باو [بە تایبەت ناسیونالیستە کوردەکان]، کێشەی چەپی کوردی رۆژهەڵات ئەوە نییە ئینتمای چینایەتی هەیە و حەول بۆ دروست کردنی کۆمەڵگایەکی یەکسان دەدات، بە عەکسەوە ئەمە خۆی لە خۆیدا ئامانجێکی پیرۆزە و ئەخلاقیشە، کەڵکەڵەی هەبوونی کۆمەڵگایەک کە تێیدا «عەدالەت» دەستەبەر کرابێ یێکێک لەو پرسە گرینگانەیە کە لە فەلسەفەی سیاسی دا بە مەبەستی شەرعیەت دان بە حوکمرانی هاتۆتە بەرباس، واتا بۆ ئەوەی حوکمران دەسەلاتێکی مەشروعی هەبێ و خەڵکیش پەیرەوی ئەو دەسەڵاتە بێ، پێویستە یێکێک لە ئامانجە سەرەکیەکانی حوکمران چەسپاندنی عەدالەت و مامەڵەکردنی یەکسان لەگەڵ تاکەکانی کۆمەڵگا بێ. کێشەکە کاتێک دروست دەبێ کە چەپی کوردی رۆژهەڵات دەبێتە بە پاشکۆ و بەشێک لە جەستەی چەپی ئێرانی. واتا کاتێک دەیهەوێ ببوون و دەرکەوتەی هەبێ، لە بری ئەوەی سیستەمێکی مانادار و واتادار لە هەناوی تێزەکانی مارکس، بۆخۆی بەرهەم بێنێ و لە دۆخی مێژوویی - مەعریفی - ئانتۆلۆژی تایبەت بە خۆ، داڵغەکانی خۆی پرۆبلیماتیزە بکات، دەچێتە پاڵ سیستەمی مانای مارکسیسمی ئێرانی و لە ژینگە - جەهانی ئەو دا خۆی ئاراستە دەکات. لێرەدا مارکسیسمی کوردی رۆژهەڵات، مارکسیسمێک نییە کە چینی کرێکار و زوڵم لێکراوی خۆی واتا پرۆلتاریای کورد رزگار بکات، بەڵکوو دیسان «پرۆلیتاریای کوردی» دەبێ چاوەرێی فریادرەسی «پرۆلیتاریای ئێرانی» [لە واقع دا پرۆلیتاریای فارس] بمێنێتەوە و فەرمانی شۆرش لەوی وەرگرێ. بەجێی ئەوەی سوسیالیسم وەک تاکە رێگەی رزگاری بەشەریەت بۆ خۆی دابمەزرێنێ و دەوڵەتی سوسیالیستی کوردستان بە ئامانجی دوارۆژی خۆی بزانێ، هێز و وزەکانی خۆی چر دەکاتەوە بۆ ئێرانی گەورەی فەرهەنگی لە فۆرمی سوسیالیسم دا. ئێرانێک کە پرۆلیتاریای کوردی هیچ ئینتمایەکی بۆ نییە و بگرە بە حوکمی ئەو چەوساندنەوەی بە دژی کراوە بە ئاستێکی بەرز، لەو چەمکە بێزارە و نایهەوێ دووبارە بچێتەوە ژێر دەسەڵاتی. مێژووی هاوبەش و هەست و سۆزی هاوبەشی کرێکۆڵ و کرێکاری کورد لە گەڵ نیشتمانەکەی خۆیەتی و ژینگە - جیهانەکەشی جیاوازە لەو ژینگە-جیهانەی ئێرانیەکان تێیدا ژیاون. تەنانەت لە باری «پەیوندیەکانی بەرهەم هێنان»یش جیاوازێکی زۆر هەیە؛ سەرمایەداری [هەڵبەت ئەگەر دانی پێدانێین لە کوردستان ئەو قۆناغە تەجروبە کرابێ] لە رۆژهەڵاتی کوردستان بە مێکانیسم و کارگێرێکی جیاواز لە سەرمایەداری سەنعەتی ئێرانی خۆی نیشان داوە، هەروەک لە سەرەتاوە باسمان لە جیاوازیەکانی سوسیالیسمی مائۆیی و لێنینی کرد لێرەشدا ئەشێ باس لە ئێلێمان و توخمە جیاوازەکانی سوسیالیسمی کوردی و ئێرانی بکەین. سوسیالیسمی کوردی رۆژهەڵات پێویستە بە دنیابینی سەرچاوەگرتوو لە پرس و داڵغەکانی کۆمەڵگای خۆی، چارەسەری دۆخی کرێکارانی کورد بکات. پاراستنی بونیاد و چوارچێوە داسەپاوەکانی ئێران و حەول دان بۆ چارەسەری بە پشت و پەنای سوسیالیسمی ئێرانی، ناتوانێ «سەرخان»ـە سیاسی و کلتوریەکان بگۆرێ. هەر ئەو «سەرخان»ـەش رێگرە لەوەی مەفاهیمی تازە لە حەوزەی سیاسی، ئابووری و کلتووری بێتە ناو جوغرافیای سیاسی ناوچەکە.




This moves in a spiral pattern.
The base is generally dominant.



# نفت ما را بیچاره کرد!

**ڕێباز چالاکی**

پس از پایان نخست وزیری «امیر عباس هویدا» در سال ۱۳۵۶ و واگذاری ریاست دولت به «جمشید آموزگار»، یکی از مقامات بانک مرکزی نزد نخست‌وزیر جدید می‌رود و از یک خطای فاحش در سیاست ارزی دولت هویدا پرده برمی‌دارد. وی به جمشید آموزگار هشدار می‌دهد که این خطا یعنی «تثبیت نرخ اسمی دلار در طوفان تورمی نیمه اول دهه پنجاه» جز با افزایش نرخ دلار از هفت تومان به ۱۱ تومان قابل جبران نخواهد بود. نخست‌وزیر جدید استدلالات این مقام بانک مرکزی را می‌پذیرد، اما از وی می‌خواهد که این مسئله را در حضور «شاه» مطرح کند. پاسخ شاه ظاهراً شبیه همان افسانه‌ای بود که از هویدا درخصوص **عدم تغییر قیمت کبریت** یا **خودکار بیک** در ۱۳ سال دوره نخست‌وزیری وی نقل شده است. شاه به نخست‌وزیر اقتصاددان تشر می‌زند که «هویدا ۱۳ سال نرخ دلار را در هفت تومان تثبیت کرد و حالا شما یک‌شبه می‌خواهید دلار را بیش از ۵۰ درصد گران کنید؟!»

«**میلتون فریدمن**» اقتصاددان شهیر آمریکایی بر این باور بود که دولت‌ها هیچگاه نمی‌توانند در درازمدت سیاست‌های پوپولیستی خود را که مبتنی بر ثبات منحصری چند کالای خاص و اساسی است، ادامه دهند و بلاخره فنر این عوام فریبی با شتاب بسیار زیادی درمی‌رود.

فریدمن بر این باور بود که اقتصاد یک کشور به مانند یک بادکنک در حال باد کردن است؛ بدین صورت که اگر یک بادکنک در حال باد کردن را از یک نقطه با انگشتتان فشار دهید، ظاهراً از برآمدگی آن نقطه جلوگیری کرده‌اید، اما به محض اینکه از فشار دادن آن نقطه دست بردارید، آن ناحیه سریعاً با سایر سطوح همگن می‌شود؛ حال این را به اقتصاد ایران تشابه دهید، دولت در ۵۰ سال گذشته با ثبات نرخ ارز و انرژی در طی دوره‌هایی مقطعی توانسته است ثبات نسبی در بازارها و مواد مصرفی پدید آورد، اما همواره این ثبات‌ها بیشتر از ۵ سال دوام نیاورده است و به محض اینکه دولت توانایی خود را برای نگهداری این ثبات مصنوعی از دست داده است، قیمت‌ها در مدت بسیار کوتاهی بعد از ثبات مصنوعی، با شتاب بسیاری جهش یافته‌اند.

تمام شواهد تاریخی گویای آن است که از شکوفایی اقتصادی دهه ۴۰ که با معماری «**علی‌نقی عالیخانی**» وزیر اقتصاد ایران (۱۳۴۲ تا ۱۳۴۸) و نه هویدا یا شاه شکل گرفت، در پایان دولت هویدا، جز ویرانه‌ای باقی نمانده بود. این ویرانی اقتصادی اگرچه در دلارباران نفتی دهه پنجاه و سیل واردات از چشم مردم پوشیده ماند، اما بیماری هلندی ناشی از جشن دلارهای نفتی، نهال نوپای تولید در اقتصاد ایران را خشکاند و انبوهی از ورشکستگی را به ارمغان آورد.

شاید بسیار شنیده یا دیده باشید که در دولت فلان شخص همه فقیرتر شدیم و سفره هایمان خالی‌تر شد، اما واقعیت کمی با تفاسیر متفاوت است؛ صد البته که این ناکارآمدی تأثیر بسزایی در کوچک‌تر شدن سفره- هایمان دارد اما این وضعیت یک بیماری مزمن است که قریب به پنجاه سال است با گوشت و خون اقتصاد ایران عجین گشته است. سال ۱۳۰۸ زمانیکه لایحه‌ی «**قانون اجازه تفتیش و نظارت بر خرید و فروش اسعار (ارزهای) خارجی**» در مجلس وقت تصویب شد، خرید و فروش و نگهداری ارز توسط مردم ممنوع شد و صرفاً به انحصار دولت درآمد، این شروع ماجراست؛ زمانی که نفوذ دولت در اقتصاد نهادینه شد و «اقتصاد دولتی» پدید آمد؛ این بود که دولت صاحب ارز شد و من باب میل خود آن را خرج می کرد.

شوک نفتی ۱۳۴۸ تا ۱۳۵۲ باعث شد که درآمد نفتی از یک میلیارد دلار فراتر برود این پول هنگفت شاهنشاه را دچار تکبر کرد و باعث شد بیماری مزمنی به جان اقتصاد نوپای ایران بیاندازد که در جهان آن را **بیماری هلندی** می‌نامند.

در بیماری هلندی دولت با فروش منابع طبیعی علی‌الخصوص نفت درآمد هنگفتی به دست می‌آورد؛ طبیعی است، سیاستمدار کارش عوام‌فریبی است، آن‌ها این درآمد سرشار را که مفت به چنگ آورده‌اند یا به **بودجه عمومی** تزریق می کنند یا دست به **واردات سنگین** می‌زنند که دو مشکل به وجود می آورد یک **رشد نقدینگی** و دو **صنعتی زدایی و ورشکستگی تولیدات داخلی**.

دولت فخیمه جناب هویدا با درآمدهای نفتی توانست **تورم زیر ۵ درصدی ایران را در دهه‌ی ۴۰ به بیشتر از ۲۰ درصد در سال های ۵۵ و ۵۶ برساند؛** چرا؟ چون آریامهر می‌خواست ما را به دروازه‌های تمدن برساند. ایشان می‌فرمودند که «**آنقدر پول داریم که حتی می‌توانیم مشکلاتمان را بخریم!**» این در حالی بود که کارشناسان سازمان برنامه در سال ۵۳ در کنفرانس رامسر هشدار داند که تزریق پترودلار جهت توسعه-طلبی‌های بلندپروازانه شاه پیامدهای نامطلوبی به همراه می‌آورد، زیرا اقتصاد ایران ظرفیت آن را ندارد؛ آنها به صراحت گفتند که «**اگر این پول‌ها (درآمدهای نفتی) را به اقتصاد تزریق کنید، انقلاب می‌شود**» و اینگونه نیز شد. با کاهش شدید قیمت نفت در سال ۵۶ درآمدها کاهش و رکود تورمی اقتصاد را دامن گیر کرد؛ یک سال بعد نیز انقلاب شد!

در دهه ۵۰، شاه عملاً سیاستگذاری اقتصادی را در دست گرفت. اما درک او از اقتصاد چهار اشکال داشت:

**۱- محدودیت منابع تولید را نمی‌پذیرفت، لذا آنقدر اعتبار بانکی ارزان به صنایع داد تا تورم بالا دامنگیر اقتصاد شد.**
**۲- می‌خواست با دلارهای نفتی توسعه ایجاد کند، لذا اقتصاد را به بیماری هلندی مبتلا کرد.**
**۳- برای مسائل اقتصادی، ریشه سیاسی و راه‌حل امنیتی قائل بود و به نوعی اسکیزوفرنی اقتصادی دچار شده بود.**
**٤- گران فروشی را علت تورم می‌دانست، در حالیکه گران‌فروشی معلول تورم است. علت تورم، رشد نقدینگی است.**

این چهار اشتباه، در نهایت ترمز اقتصاد کشور را کشیدند؛ به‌نحوی

که در سال ۵۶، رشد اقتصادی متوقف شد، بیکاری افزایش یافت، و تورم به بیشتر از ۲۰ درصد رسید. در طول چهل سال بعد، همین اشتباهات بارها در سیاستگذاری اقتصادی ایران تکرار شدند تا تورم و بیکاری مزمن بلای جان مردم شود، با این تفاوت که در آن زمان خیره سری آریامهر باعث شد، اکنون تز و رساله‌ی کارشناسان و مشاوران وزارت اقتصاد، بانک مرکزی و سازمان برنامه و بودجه!




اینگونه شد که دلارهای نفتی به جای آن که موجب آسایش مردمان این کشور شود، باعث فقیرتر شدن‌مان شد؛ این رابطه معکوس میان عملکرد و ثروت طبیعی را **نفرین منابع طبیعی** می‌نامند.

یک دولت سالم، با درآمدهای مالیاتی اداره می‌شود. درآمد چنین دولتی، با رشد اقتصاد بیشتر می‌شود؛ اما دولتی که با پول نفت اداره می‌شود، از مالیات مردم بی‌نیاز است، متعاقباً رشد اقتصادی هم نفع خاصی برایش ندارد و با اینکه حرف از رشد اقتصادی، ورد زبان چنین دولتی است، اما اقدام عملی برای رشد اقتصادی صورت نمی‌دهد. **برای تثبیت قدرت یک دولت نفتی، فقط کافی است مردم را در یک رضایت نسبی نگه داشت؛ برای راضی نگه داشتن مردم، دولت باید این «احساس» را در مردم ایجاد کند که درآمدشان برای یک زندگی خوب کافی است.**

از سال ۵۳ که نفت گران شد، دولت از محل درآمد نفتی، نرخ دلار را سرکوب می‌کرد تا اجناس وارداتی ارزان باشد و گاهی به اسم تنظیم بازار، خود مستقیماً اقلام خوراکی وارد می‌کرد و زیر قیمت بازار توزیع می‌کرد. در واقع به پشتوانه ثروت نفتی، کالاها را ارزان می‌کرد تا قدرت خرید مردم بیشتر از تولید اقتصادیشان بشود.

البته دولت‌های مدبر ایران به لطف تثبیت نرخ ارز یا بهتر بگوییم «دکّان ارزان فروشی دلار» برای چینی‌ها و ترکیه‌ای‌ها اشتغال بسیار خوبی پدید آورده و کارآفرین و تولیدکننده داخلی را به خاک سیاه نشانده‌اند. حتماً شنیده‌اید که می‌گویند: «تو ایران کار صنعتی جواب نمی‌ده، دلالی بهتره.» دلیلش **سیاست سرکوب ارزی** است.

واردات اقلام خوراکی هم کشاورز را بیچاره کرد، این شد که کشاورزها یا زمین‌شان را فروختند و به شهر مهاجرت کردند یا اگر به کشاورزی ادامه دادند، جزء فقیرترین دهک‌های جامعه شدند.

بدین ترتیب، نفت دولتی اقتصاد را بهم ریخت، مردم را فقیر کرد و به یارانه‌های دولت وابسته‌شان کرد. نیم قرن است که مردم از دولت می‌خواهند که فکری به حال معیشت‌شان بکند و از بیکاری نجات‌شان بدهد، اما هر سال معیشت مردم سخت‌تر، نرخ بیکاری بیشتر و کالا گرانتر شده است.

رشد نقدینگی ناشی از تبدیل دلارهای بادآورده نفتی به پول داخلی، مسیر جذب نقدینگی را از سرمایه‌گذاری در صنعت و بخش‌های تولیدی به جیب مردم تغییر می‌دهد.




از طرفی دولت توانایی واردات زمین و مسکن ندارد، پس بخش عظیمی از این پول پاشی به اقتصاد سبب می‌شود که قیمت خانه و زمین بسیار بالا برود و چون زمین و مسکن بخش اعظمی از اقتصاد را به خود اختصاص داده است، گام بعدی نیز که صرف هزینه قابل توجهی جهت مسکن یعنی خرید یا اجاره است پس اول بیکار و فقیر شدیم و سپس سرپناه مناسب مان را از دست دادیم؛ البته به لطف نفت!

تورم اساساً یک پدیده پولی است و در کل رشد نقدینگی (به‌عنوان افزایش تقاضا) و نیز کاهش تولید به علت افزایش هزینه، تورم را به وجود می‌آورند.

در تمام دنیا بانک مرکزی با توجه به سیاست گذاری‌های پولی خود می‌توانند به رشد نقدینگی در جامعه به عنوان سیاست‌های انبساطی در زمان رکود و نیز با جمع‌آوری نقدینگی در سطح جامعه به عنوان سیاست‌های انقباضی موجبات اشتغال زایی، رشد اقتصادی، ثبات قیمت‌ها و ثبات بازارهای مالی و ارزی را به وجود آورد که از آن به عنوان تغییرات نرخ بهره یاد می شود این ابزار در تمامی اقتصادهای دنیا در اختیار بانک‌های مرکزی قرار دارد که کشور را به سمت اهداف بالا سوق می‌دهند، اما بانک مرکزی ایران بیشتر به یک ماشین چاپ پول شبیه است.

دولت ایران در طی پنجاه سال گذشته با استقراض از بانک مرکزی -بخوانید غارت اموال عمومی- و تزریق ریال بی‌پشتوانه به بودجه عمومی موجبات تشدید تورم و کوچک‌تر شدن سفره‌های مردم را فراهم کرده است.

از طرفی دیگر بانکهای دولتی با پرداخت سودهای موهومی [گاهی

تـا بیشـتر از ۲۵ درصـد سـالانه]، پول‌هـای کلان را از بخش‌هـای تولیـدی بـه سـمت خـود کشـیده و رکـود را در تولیـد رقـم زده‌انـد؛ **ایـن بانک‌هــا چــون بخــش تولیــدی را بــه رکــود برده‌انــد، پــس ســود سرمایه‌گذاری‌هایشــان کفــاف ایفــای تعهداتشــان را نمی‌دهــد، همچنیــن عــدم بازگشــت وام‌هــای کلان پرداختــی بــه دلیــل عــدم نظــارت صحیــح بانــک مرکــزی، بانک‌هــا را ناچــار بــه خلــق نقدینگــی از طریــق افزایــش پایــه پولــی (پــول بیــن بانکــی) کــرده اســت.**

تامیـن منابـع ریالـی بودجـه در ایـران، مسـتلزم فـروش درآمدهـای نفتـی بـه بانـک مرکـزی اسـت. اگـر درآمدهـای نفتـی دولـت افزایـش یابـد بـه سـبب آنکـه سـاختار اقتصـادی کشـور دولتـی اسـت، یعنـی دولـت بـه عنـوان بزرگتریـن تولیدکننـده و مصرف‌کننـده عمـل می‌کنـد، پـس مخـارج‌اش را افزایـش و تقاضـا در اقتصـاد چنـد برابـر می‌کنـد و نـام آن را **رشـد اقتصـادی** می‌نهـد! در حالـی کـه رشـد اقتصـادی زمانـی رخ می‌دهـد کـه ارزآوری دولـت و جامعـه ناشـی از تولیـد داخلـی و تجـارت باشـد نـه تغییـر منطـق اقتصـادی و ایجـاد تقاضـای کاذب! آنچـه کـه سـال ۹۵ و ۹۶ رخ داد.

حـال فـرض کنیـد بـه هـر دلیلـی از جملـه کاهـش شـدید قیمـت نفـت یـا کاهـش فـروش در اثـر تحریـم یـا کاهـش تقاضـای جهانـی بـه دلیـل یـک پاندمـی یـا تغییـر رویکـرد بـه انـرژی هـای نـو، ایـن درآمـد بـادآورده دیگـر سـر از سـفره دولـت درنیـاورد؛ چـه مـی شـود؟ دولـت دیگـر نمی‌توانـد دلارهـای نفتـی را بـه بانـک مرکـزی بدهـد، پـس بـرای تامیـن بودجـه، دولـت بانـک مرکـزی را مجبـور بـه چـاپ پـول می‌کنـد؛ پـس ایـن نـرخ هـای تصنعی شـاید بتوانـد مدتـی کوتـاه بـرای اقتصـاد شـور شـوق بسـازد، امـا مسـکنی بیـش نیسـت. شـوک‌های نفتـی ۵۲ تـا ۵۶ و نیـز ۸۴ تـا ۹۰ ایـن گفتـه‌هـا را تاییـد می‌کننـد.




سـوأل اینجاسـت کـه چـرا هیچـگاه اصـلاح سیاسـت‌ها مـد نظـر قـرار نمی‌گیـرد؟ شـاید بتوانیـم اینگونـه پاسـخ بدهیـم کـه تمرکـز بـر روی رفـاه عمومـی -بخوانیـد عوام‌فریبـی- بـه جـای تقویـت بنیـه تولیـد، تـر و خشـک را بـا هـم سـوزانده اسـت.

حجـم پـول در گـردش همیشـه بـا تولیـدات و خدمـات یـک سیسـتم اقتصـادی متناسـب اسـت و اگـر رشـد پـول بیشـتر از رشـد تولیـدات و خدمـات یـک جامعـه باشـد، قیمـت هـا بـه انـدازه رشـد پـول [یـا شـاید در اثـر شـوک اقتصـادی بیشـتر] افزایـش یافتـه تـا بـه نـرخ تعادلـی خـود برسـند و تـورم را حاصـل کننـد.

آثـار ناشـی از تثبیـت قیمت‌هـا حتـی در دوره‌ی تثبیـت نیـز بـه ثبـات عمومـی قیمت‌هـا کمکـی نمی‌کنـد. وقتـی دلالـی بـه جـای تولیـد، کمـال می‌یابـد؛ زمانـی کـه بازرگانـی بسـی بیـش از تولیـد مجـال می‌یابـد، تولیـد ناخالـص داخلـی و به‌دنبـال آن درآمدهـای دولتـی فـرو می‌کاهـد؛ کسـری بودجـه‌ی دولـت و متعاقبـاً اسـتقراض دولـت از بانـک مرکـزی فزونـی می‌یابـد. نقدینگـی بی‌افسـار می‌شـود و اقتصـاد بـه مشـکل تـورم دچـار می‌شـود.

شـاید بـرای برخـی ایـن شـبهه پیـش بیایـد کـه خـب بلاخـره ثبـات قیمـت دلار بهتـر از آن اسـت کـه قیمـت آن توسـط دلالان هـر روز بـالا بـرود و در نهایـت ارزش پـول ملـی روز بـه روز پاییـن‌تـر بیایـد؛ امـا بایـد بـه ایـن مسـئله قائـل شـد کـه بانـک مرکـزی بـا تزریـق پتـرودلار بـه بـازار نمی‌توانـد ارزش پـول ملـی را مصنوعـی بـالا نگـه‌دارد، زیـرا کـه **تخریـب پـول ملـی پدیـده‌ای اسـت کـه در اثـر نیـروی فرسـاینده تـورم اتفـاق می‌افتـد، نـه در اثـر افزایـش نـرخ ارز!**

متاسـفانه مشـکلات اقتصـادی نیـروی اندیشـیدن بـه آزادی‌هـای فـردی و اجتماعـی را از مـردم ایـران گرفتـه اسـت. آنچـه کـه می‌توانـد شـکوفایی اقتصـادی را بـه جامعـه و مـردم برگردانـد، **اعطای آزادی‌های اساسـی و حقـوق شـهروندی و نیـز ایجـاد یـک بـازار آزاد واقعـی بـدور از مرکزگرایـی و نـگاه امنیتـی** اسـت. حکومـت بایـد بـه ایـن مسـئله قائـل شـود کـه نیازمنـد **تغییـرات اساسـی در حکمرانـی داخلـی، گسـترش روابـط اقتصـادی اسـتراتژیک بیـن المللـی بلندمـدت، افزایـش تجـارت خارجـی مؤثـر و جلوگیـری از خصولتـی شـدن فعالیت‌هـای اقتصـادی گـردد،** اسـت.



## مسئله‌ی کورد و شهروندی در ایران

هادی قادرنژاد

دیر بازیست که گفتمان مسلط و حاکم در ایران کوردها را «مرزداران رشید»، «شجاع»، «مهمان نواز» و «غیورترین قوم ایرانی» می نامد، از این زاویه‌نگاه، کوردها آدمهای صاف، ساده و مهربانی هستند که دارای سنت و فولکلور مشخصی بوده و فرهنگ بومی قابل ستایشی دارند. می‌توانند صدا و سیمای محلی داشته باشند و خواسته‌های فرهنگی و زبانی خود را در آن مطرح کنند. عناصر هویت بخش فرهنگی نظیر لباس، موسیقی، هنر و ادبیات خود را تحت نام فرهنگ قومی یا محلی شکوفا کنند و البته سالانه بودجه‌ی ناچیزی را در همایش‌ها و فستیوال‌ها صرف تعالی آن کنند.




این نگاه و ذهنیت از انسان کورد، شهروند بودنش را زیر سوال می‌برد و آن را به بعضی از عناصر فرهنگی تقلیل می‌دهد. انسان کورد در این گفتمان؛ روستایی، سنتی، شهر ندیده و بومی به شمار می‌آید بطوریکه با ساماندهی جایگاه آن در نظامی از معانی، استعاره‌ها و ایماژها در سایه‌ی کلماتی همچون «سلحشور»، «غیور»، «مهمان نواز»، «شجاع» دست به استحاله‌اش می‌زند و او را از دایره‌ی «شهروندی» خارج می‌کنند. این در شرایطی است که «شهروند»، انسانی عادی و اما محق است که احتمال اینکه خطا بکند، مبارز و شجاع و غیور نیز نباشد در او وجود دارد، و چه‌بسا این انسان می‌تواند مهمان نواز هم نباشد.

معمولاً، مجموعه صفاتی مانند «شجاع، غیور، دلیر مرد و مرزدار» را نه به یک «شهروند» بلکه، به یک شخصیت نظامی، همچون سرباز، رزمنده، سپاهی و سرلشکر نسبت می دهند. «شهروند» اساساً مفهومی سیاسی است که رابطه‌ی فرد با دولت را مشخص می‌کند. در این رابطه، فرد حقوق سیاسی مشخصی دارد و دولت ملزم است آن حقوق را پاس داشته و در جهت برآوردن آن گام بردارد. فردِ شهروند مسئول حال، آینده و سرنوشت خویش است و این حق می‌بایست به عنوان حقی بنیادین به رسمیت شناخته شود.

نخستین گام در ساختن ذهنیت شهروندی از انسان کورد، تمیز دادن آن از سربازان و رزمندگان است. همچنین می‌بایست علاوه بر تاکید صرف بر المان‌های فرهنگی، هویت سیاسی آن را نیز از طریق برساخت واحدهای سیاسی مستقل برجسته ساخت.

همان گونه که هانا آرنت فیلسوف آلمانی میگوید، «امروزه یک فرد بدون تعلق به یک دولت، شهروند محسوب نمی شود، و چه‌بسا در شرایط بحرانی، انسان هم به شمار نمی‌آید». بنابراین در شرایطی که داشتنِ نهاد سیاسی دولت، پیش شرط و پشتوانه‌ای برای انسانیت و بودنِ فرد در دنیای امروز می‌باشد، فقدان آن به معنای ماندن در حاشیه‌ی تاریخ و نمایانگر بی‌وجودی است.

از اینرو تنها راه چاره، شکستن عنصرهای موجود در گفتمان کوردولوژی (کردشناسی) گفتمان حاکم، و حرکت به سوی ایجاد حاکمیت مستقل خودی که می تواند شأن و کرامت را به انسان کورد باز گرداند، می باشد؛ تنها در چنین چارچوبی است که مفهوم «شهروند»، توانایی عینیت بخشی به وجود و بودنِ چنین انسانی را، با حداقل معیارهای موجود جهانی، تضمین می کند.

# چەمکی شۆڕش و پرسی مۆدێرن

ئۆلیڤەر داڤیلۆ هۆلمز، وەرگێڕان: ڕێباز سابیر

شۆڕشی فەرەنسی، مانا مۆدێرنەکەی چەمکی شۆڕش ڕووندەکاتەوە. چەمکێک کە بەشێک بوو لە ئەدەبیاتی فکری ئەوروپای پاش سەدەی هەژدە. تا پێش سەدەی هەژدە بۆ لێکدانەوە و ڕاڤەی ڕووداوە مێژووییەکان سود وەر دەگیرا لە دوو کاتیگۆری سروستی پەیوەست بە کات و مێژوو. یەکەم سوڕی گەردوونی (ئەستێرە و هەسارەکان) دووەم سیستەمی پشتاو پشتی خانەدان و ڕەچەلەکی پاشاکان. کات کە تەنها لەچوارچێوەی مێژوودا خۆی دەردەخات. بەرهەمی پێشبینیە فەلسەفییەکان سەبارەت بە کاتی مێژووی بەرئەجامی ئەزمونی -١٧٨٩- بوو. لەو کاتەدا شۆڕشی فەرەنسا وادەهاتە پیش چاو لە گوژم بەخشین بە کاتی مێژووی هەموو ئەزموونەکانی پێش خۆی تێپەڕێنێت.

وشەی شۆڕش مانای جیاواز هەڵدەگرێت. هەم بە مانای شڵەژانی کۆمەلایەتی جەنگی ناوخۆ دێت. هەم بە مانای گواستنەوە و گۆڕانی درێژخایەن لە پێکهاتەی واقعی ژیانی ڕۆژانە دێت. ئەم وشەیە مانایەکی فراوانی لە خۆیدا هەڵگرتوە. هەم ئاماژەیە بۆ کارەساتی سیاسی و کۆمەلایەتی خوێناوی کە چەمکێکە لە جیۆلۆجیادا بەکاردیت. بەمانای ترازان و ڕۆچونی بەشێک لە زەوی. هەم بەکاردێت بۆ دۆزینەوە و نوێگەریە زانستییەکان کە لەو بوارەدا ئەنجام دەدرێت. هەروەها چەمکی (شۆڕش) ئاماژەیە بە دەستکەوتە مێژووییەکانمان لە مۆدێرنیتەدا. لەم وتارەدا هەوڵدەدەین لە کنەکردن و کەشف کردنی ڕیشەی ئەم چەمکە. پێش قۆناغە سەرەتاییەکانی سەرهەدانی شۆڕشی فەرەنسی. بەئامانجی ئاشنابوون بە ڕواڵەتە تایبەتەکانی کە مانا مۆدێرنەکەی ئەم چەمکەیان پێکهێناوە.

چەمکی شۆڕش ڕیشەکەی یۆنانیە. دوو مانا و دەلالەتی گرنگی لە خۆیدا هەڵگرتوە. واتە گۆڕان شوێنگۆرکێی خۆبەخۆی شتێک. یان جوڵەیەک کە لە کۆتادا بۆ بنەماکەی خۆی دەگەڕێتەوە. بەدرێژایی سەدەی ١٦ چەمکی شۆڕش برەوی گشتی هەبوو. لەنێو شیکاری و لێکدانەوەی جوڵەی تەنە گەردوونیەکاندا مابویەوە. هەتاوەکو کۆپەرنیکۆس تیۆریەکەی خۆی خستەروو. تێدا بە شێوەیەکی زانستی خشتە و هەژماری سوڕی هەسارە و ئەستێرەکانی تێدا ڕوونکردبویەوە. توێژینەوەیەکەیدابە ناوی(شۆڕشە گەردوونیەکان- ١٥٤٣) بڵاوی کردەوە. لەو دەمەوە وشەی (شۆڕشەکان) بۆتە کاتیگۆریەکی هونەری لە ئەستێرەناسی و گەردوون ناسیدا بۆ ڕوونکردنەوەی جوڵە و سوڕی گۆی زەوی. هەم لەرووی بازنەیی و هەم لە ڕووی مەوداوە. هەروەها جوڵەی تەنە ئاسمانییەکان لە پەیوەندیدا بە کاتەوە لەگەڵ یەکتر. کاریگەری بلاوبونەوەی ئەم کاتیگۆریانە لە لێکدانەوە و ڕوونکردنەوەی جوڵەی تەنە ئاسمانیەکان بەشێوەیەکی بەرفراوان بڵاوبوویەوە. لە دەرئەنجامدا بزوونتنەوەی سیاسی لێکەوتەوە. بۆچی خستنە ڕووی بیروڕای جوڵەی گەردوونی نوێی ئەستێرەکان هێندە پەیوەندی بە چالاکی و گۆڕانی کۆمەلایەتی و سیاسیەوە هەبوو بەدرێژایی سەدەی ١٦. جوڵەی سروشتی گەردوون وێنەدانەوەی جوڵەی سەر ڕوی زەوی بوو. گەردووناسی



کۆن و گەردووناسی نویێ ئاوێتەی یەکتربوون. بەو مانایەی وشەی شۆڕش هەم بەمانای جوڵەبوو هەم بەمانای گەڕانەوە بۆ خاڵی دەستپێک بوو. هەر بۆیە وشەیەکی زۆر گرنگبوو بۆ تێرمۆنۆلۆژیای سیاسی سەبارەت بە گۆڕانی دەسەڵات. گۆڕانی باوەڕگەلێک بەئامانجی گواستنەوەو گەشەسەندنی سیاسی کە لە دۆخێکی بازنەیی و جەبریدابوو.
وشەی شۆڕش پێ بە پێ بە تێرمنۆلۆژیای سیاسی سەدەی حەڤدە شێوەی دەبەخشی. بەتایبەت لە کۆنتێکستی مشتومر و هەڵسەنگاندنی بڕیارەکان لە دامزراندنی شۆڕشی (پیوریتانەکان) ساڵی ١٦٤٨. هەروەها شۆڕشی شکۆمەندی ساڵی ١٦٨٨. هەندێ لە تیۆریسیانەکان پێیان وایە، گرفتە سیاسییەکان وێنەدانەوەی جوڵەی فەلەکین. گواستنەوەی ئەم مانایەی فەلەک ناسی بۆ مێژووی سیاسەت لە کارەکانی -ئیدوارد هاید-، کونت کلارندن-دا دەبینرێت. وەک کتێبی (مێژووی ڕاپەرینەکان و جەنگی ناوخۆی ئینگلتەرا). کلارندن لەم کتێبەدا ئاماژە بەهێزێک دەکات کە بە ژێرخانی ڕوداوەکانی ساڵی ١٦٦٠ ناوی دەبات. کلارندن دەڵێت ئەو هێزە کە بۆتەهۆی جوڵانەوەکانی بیست ساڵی کۆتای

بەهۆی سەرکەوتنی هەسارەی شەیتانی یان هەسارەی شومەوەیە. هەرچەندە کلارندن ئەم هەسارە شەیتانیە بە هۆکاری ئاژاوە و کارەساتەکانی ئەم ٢٠ساڵە دەزانێت. بەڵام ئەم سەرهەڵدان و ڕاپەرینانە بە هۆکاری دوبارە نوێبونەوە و تازە بوونەوە ناوزەندەکات. بەتایبەت پاش گەڕانەوەی کۆتایی ستیوارتەکان بۆ دەسەلات. تۆماس هۆبز لە نێو ڕوداوە مێژووییەکاندا مشتومڕی سەردەمی نووسەرە سیاسییە کلاسیکیەکانی دیتبوو. ئەو دەربارەی مشتومڕە لەبیرنەکارەکانی جەنگی ناوخۆ دەڵێت؛ من لەو شۆڕشەدا بینەری ڕۆژگاری دەسەڵاتی فەرمان ڕەوابووم. بە دەستی دوو ستەمکار. باوک و کور. واتە لەپاشای کۆچکردووەوە بۆ کور.... واتە گوێزانەوەی دەسەڵاتی پاشا چارلزی یەکەم بۆ پەرلەمانی درێژ ماوە کە لەساڵی(١٦٤٠-١٦٦٠) چالاک بوو. هەروەها لەم پەرلەمانەوە بۆ ئەم پەرلەمانی دواتر. لەم پەرلەمانەشەوە بۆ ڕیچارد کەرامۆڵ و لەپاشاندا دوبارە لە ڕیچارد کەرامۆڵەوە بۆ پەرلەمانی دواتر. وە لە مەوە بۆ پەرلەمانی درێژ خایەن. لەمەوە بۆ پاشا چارلزی دوەم. کە دەسەڵاتی زۆر لەدەستدا مایەوە. لەبەرامبەردا ئاماجنی کۆتای ٢٠ ساڵەی شۆڕش. لەواقیعدا دوبارە گێرانەوەی دەسەڵاتی پێشوو بوو. هەروەها گێرانەوەی یاسای پێشو واتە گەڕانەوەی یاسای بنەڕەتی و حەقیقی.

هۆبز لە سەردەمی خۆیدا یەکێک لە ڕەهەندە جەوهەریەکانی وشەی شۆڕشی دەرخست. بەوشێوەیەی زەمینەسازی بۆکرد کە لای تیۆریسیانە کلاسیکەکان هەبوو. بۆ وێنە: ئەفلاتون لە دیالۆگی (تیمائۆس)دا شتانێک دەڵێت کە بەتەواوی نیشانی دەدات تیۆریسیانەکانی سەدەی ١٧ سودی تەواویان لە ئەفلاتوون وەرگرتوە. بەتایبەت وتەکانی دەربارەی سوڕی گەردوون و تەنە ئاسمانیەکان.




هەسارەی مانگ ماوەی یەک مانگی دەوێت بۆ سورانەوە بەدەوری خولگەکەی خۆیدا تا دەگات بە خۆر. هەروەها خۆر ماوەی یەک ساڵی دەوێت بۆ سورانەوە بەدەوری خولگەکەی خۆیدا. مرۆڤەکان هەندێکی کەمیان نەبێت لەسوڕی هەسارەکان و تەنە ئاسمانیەکان تێنەدەگەیشتن. کە توانای ڕێکخستنی ڕۆژەکانی ساڵیان هەیە. هەروەها لە یەک ساڵی تەواودا هەر هەشت هەسارەکا سوڕی خۆیان تەواو دەکەن و دەگەڕێنەوە بۆ خاڵی سەرەتای خولگەکانیان. ئەمە هەمان سوڕی گەردوونیە کە بۆ هەمیشە بە یەکسانی دوبارە دەبێتەوە. بەکورتی گشت ئەستێرەکان کە لە بۆشای گەردووندا دەسوڕێنەوە. ئەو پەیامە دەگەیەنن کە ئافرێنراون بە مەبەستی زیندوو ڕاگرتنی جیهان. ئەم زیندو بوونەش لەڕێگەی دەرهاوێشتەکانی ئەقڵەوە دەتوانرێت باشتر بکرێت.

ئەم بەکارهێنانەی چەمکی شۆڕش لە ڕێگای ئەم لێکچواندنەوە بۆیە پێوەری ڕوداوەکانی ساڵی ١٦٨٨. فەلەکناسی نوێ و سیاسەتی نوێ یەکانگیربوون. جۆن لۆک ماهیەت و ڕۆڵی چەمکی شۆڕش لە (نامەی دووەمی دەولەتی مەدەنی)دا دەخاتە ڕوو کاتێک ڕایدەگەیەنێت: بێ دەربەستی و گوێنەدانی خەڵک لە ڕیشەکێشکردنی بنەمای یاسایە کۆنەکان لە بەدیهاتنی زۆرێک لە شۆڕشەکاندا دەبینرێت. هەم لە سەردەمی پاشاکانی ئەم سەدەیە و هەم پاشاکانی سەدەکانی ڕابردوو. بەم هۆیەش کۆی کۆشش و هەوڵەکان بێ ئەنجام بوون. هەر ئەم هۆکارەش ئێمەی گەڕاندەوە ژێر دەسەڵاتی مەرجداری پاشا کۆنەکان. لە ساڵی ١٦٩٤ لە چوارچێوەی زمانی ئەکادیمی فەرانسادا وشەی (شۆڕشی-هەسارەیی) جێگیر کرا. ئەم چەمکە بەشێوەیەکی ڕۆتینی و سادە لەنێو ئەنجومەنی یاساداناندا ناسێنرا. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەم بەکارهێنانەی جۆن لۆک. شۆڕشی سیاسی مانای دووبارە تێهەڵچوونەوەی وەرگرت. لە پەیوەندیدا بە دوبارە بنیاتنانەوەی فۆرمە یاسایەکان. ئەویش لەبەرامبەر شڵەژان و ڕاپەرینە کۆمەلایەتیەکان نەک بە مانای سەرهەڵدانی شۆڕش. مانای کۆتایی چەمکی شۆڕش وەک وەرچەرخانی کۆمەلایەتی بە درێژایی سەدەی هەژدە گۆڕانی بە سەردا هات.

یەکێک لە دەستکەوتە گرنگەکانی فەرەنسا کە گەشەی هزری مرۆڤی لەڕێگەی ڕۆشنگەریەوە فەراهەم کرد. (ئینسایکلۆپیدیا)ی شکۆمەندی فەرەنسی بوو. کە لە ٢٢ بەرگدا لە نێوان ساڵانی ١٧٥١-١٧٧٧-بڵاو کرایەوە. مێژوی ئارگۆمێنتسازی فیکر کە لەم ئینسایکلۆپیدیایەدا بڵاکرایەوە کۆمەکیەکی بێ پایانی کرد بە گوتاری سەدەی ١٨ دەربارەی چەمکی شۆڕش.

لە وتارێکدا لیڤی دیژۆکور کە لەم ئینسایکلۆپیدیایەدا بڵاوکراوەتەوە. دەربارەی وشەی شۆڕش دەڵێت؛ ئاماژەیەکە لە فەرهەنگی سیاسیدا سەبارەت بە گۆڕانی بەرچاو کە لە سیستەمی فەرمان ڕەوای دەوڵەتێکدا ڕوودەدات. ئەم مانایە

بەرهەمی شۆڕشی ئینگلیزی بوو. بەبڕوای نوسەر ئەو گۆڕانکاریانەی ڕویاندا لە پێکهاتە بنەڕەتیەکانی سیاسەت بەهۆی ماناو دەلالەتەکانی ئەم چەمکەوە بووە. هەروەها دەڵیت؛ ئەستەمە هەر دەولەتێک بتوانێت کەم و زۆر پێش لەسەرهەڵدانی شۆڕش بگرێت. لە درێژەی نوسینەکانیدا دەڵێت بەریتانیای مەزن شۆڕشی زۆری تێپەڕاندوە. ئینگلیزەکان ئەم ناوەیان تایبەت کردوە بەڕوداوەکانیساڵی ١٦٨٨. کەلەودەمەدا -ولیامی سێهەم- واتە شازادە –ئاڕەنج- لەجێی باوکی هاوسەرەکەی واتە جەیمز ستیوارت چۆتە سەر تەختی پاشایی. بە وتەی لۆرد بالینبۆرگ ڕاڤە هەڵەکانی پاشا جیمز سەرهەڵدانی شۆڕشی زەروری و کردەیی کردبوو. ئەم بەدچارەسەرییە سەرچاوەی نابووتکردنی کۆی ڕابەرانی پێشوو بوو. ڕیشەی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ملکەچی کوێرانە بۆ پاپای مەزن و دەسەڵاتخوازی شازادەکان. کە بویە هۆی ئەوەی گوێ بە هیچ هۆشداری و ئاگادار کردنەوەیەک نەدەن. ئەمەش بە دورخستنەوەی خانەدانەکان دەستیپێکرد. ئەم دورخرانەوەیەش بۆیە هۆی زەوتکردنی دەسەڵات لەلایەن کەرامۆڵەوە. دەسەڵاتی کەرامۆڵ بەهۆی شۆڕشی پێشووەوە بەدەست هاتبوو. هیچ پەیوەندیەکی بە بۆنەکانی بەدەست هێنانی ئازادیەوە نەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا بەدەربوو لە هەر بەڵگەو دانپێدانێکی ئایینی.

دالامبیر لە وتارێکیدا بە ناوی (لەستایشی- مۆنتیسکۆدا) لەو دەمەی لە ژیاندابوو دەڵێت تێرمنۆلۆژیای سیاسی دەوڵەت_نەتەوە پاشەکشەی بە دەسەڵاتی ئیمپراتۆرەکان کرد. دالامبێر لە توێژینەوەکەیدا بەگەڕانەوە بۆ (سیاسەتی-مەعقول)ی مۆنتیسکۆ و شیکاری بازنەیی مێژوو. هۆکاری باڵادەستبوون و دارمانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆم بە بەرئەنجامی ئەم بنەمایەیە لێکدەداتەوە و دەڵێت ( ئیمپراتۆرەکان دەبێت وەک مرۆڤەکان گەشە بکەن و پیربن و بمرن). بەڵام زەرورەتی شۆڕش هۆکارگەلێکی نادیاری لە پشتەوەیە کە لە بەرچاوی ئێمە بە ناڕوونی وتەماوی ماوەتەوە. تەنها بە پێی تێپەر بوونی کات ڕوندەبێتەوە. ئەم نادیاریە ورد و ڕواڵەتیە تەنانەت بۆ هەندێ لە هاوسەردەمەکانیش ناڕوونە. لەم لایەنەوە هیچ شتێک هێندەی مێژووی کۆن لە مێژووی مۆدێرن ناچێت.

دەیڤید هیوم لە نوسینێکیدا لەپەیوەندیدا بە گەڕانەوە بۆ دەسەڵاتی ڕەها، لە فۆرمە جیاجیاکانی دەوڵەت بەباشتر دەزانێت هەر بۆیە دەنوسێت (وابەلاوە کە هەر دەسەڵاتێک دەبێت کۆتای بێت. چۆن مەرگ بۆ جەستەی ئاژەڵەکان ناچاریە. بەهەمان ئەندازە بۆ جەستەی سیاسیش بەم چەشنەیە). بەرمەبنای ئەم ڕاڤە و شیکاریە جیهانی سیاسەت کە شۆڕش لە نێویدا ڕودەدات. جیهانێکی ڕێکخراو دوبارەبۆوەیە بەپێی ئەم یاسایە دەچێت بەڕێوە. مێتافۆری -سروشتیبوونی شۆڕش-ی سیاسی بەرمەبنای ئەم باوەڕەبوو. قۆناغە مێژویەکان هاوشێوەن و قۆناغە مێژویەکان لەنێو خۆیاندا مەحکومن بە دووبارە بونەوە.

هەر بەم هۆیەش (بان-مێژویی) بوونی شۆڕش لە گشت پرسە سیاسیەکانی دیکە زیاتر جێگای مشتومڕ بوو.

لە سەدەی هەژدەدا هەردوو چەمکی شۆڕش و جەنگی ناوخۆیی نە هاومانابوون نە شایەنی ئاوێتەکردن بوون. جەنگی ناوخۆ ئاماژەیە بە ڕووداوە خوێناویەکان کە تییدا چوارچێوە یاسایەکان توشی ناکۆکی دەبنەوە. ئەم چوارچێوە یاسایانە دەکەونە دۆخێکی کۆنکرێتیەوە و دەگەنە بنبەست. نارەزایانی سیاسی بە کەسانی لادەر و دژە یاسا ناوزەند دەکەن. لەسەرەتادا شۆڕش وابەستەبوو بە ڕاڤەیەکی بان مێژووی هۆکارە سروشتیەکان. ئاگاهیانە بەشێوەی میتافۆر هاتۆتە نێو ڕوداوە سیاسیە درێژ خایەنەکانەوە. یان بەشێوەیەکی نا ئاگاهیانە. بەم مانایە وشەی شۆڕش بە شێوەیەکی سروشتی بۆتە بەشێکی بنەڕەتی لە جەنگی ناوخۆدا.

شۆڕشی شکۆمەندی ١٦٨٨ نیشانی دابوو کە چۆن دەتوانیت دەسەڵاتیکی نا مرۆیی و قێزەون بگۆریت. بەبێ خوێن ڕشتن لە ڕێگای فۆرمی دەوڵەتی پەرلەمانیەوە. پێشینەی ئەمە جەنگی ناوخۆی خوێناوی بوو. ڤۆڵتێر بە ئاوازێکی ستایشئامێز دەڵێت (ئەو شۆڕشەی لە بەریتانیای گەورە ڕوویدا. جیاواز بوو لە دەوڵەتانی تر... کە تەنها بینەری شۆڕش و جەنگی ناوخۆی خوێناوی بێ ئەنجام بوون). بەم پێیە لە چەند ڕویەکەوە جەنگی ناوخۆ ئاماژە بە سوڕانەوەیە لە دۆخێکی بێواتادا. کە شۆڕش هەوڵ دەدات بە تێگەیشتن لەو کۆنتێکستە قۆناغێکی نوێ بێنێتە کایەوە.

دالامبێر لە وتارەکەیدا بەناوی (ئیکسپریمێنشەڵ) باس لە ڕاڤەی فەلسەفی پرۆسە مێژویەکان دەکات. بە مانایەک لەماناکان سەر بەرەگەزی بازنەین. بەپێی ئەم ڕاڤەیە شۆڕشی بنەڕەتی لە کایەی زانستدا دەگەڕێتەوە بۆ کارەکانی –نیوتن- لە مەیدانی مەعریفەی زانستیدا. ئەم بیرسایەی شۆڕش لەپەیوەند بە پرۆسەی شێوەگرتنی ڕەگەزە یەک لە دوای یەکەکان. کە لەسەر بنەماکانی پێشوو ئاماژەیی پێدابوو. بەشێوەیەکی لێکدژ دەرکەوت لەگەل جیهانبینی داڵامبێر. بەتایبەت لەگەل ئەو وتارانەی دەربارەی شۆڕش نوسیبوونی. مانایی کۆتای شۆڕش بەپێی تیۆرەی کلاسیکی زانستی ئەندازیاری و ئەستێرەناسی ڕووندەبێتەوە (بە پێی مانا ئەندازیاریەکەی؛ جوڵەی شێوە تەختەکان بەشێوەیەکی بازنەیی و جێگیر دەسوڕێنەوە. هەروەها بە پێی مانا ئەستێرە ناسیەکەی؛ بەمانای سوڕی یەک هەسارە یان ئەستێرەی کلکدار دێت). بەومانایەی ڕەوتی شۆڕش لە خالێکەوە دەستپێدەکات و تادەگەڕێتەوە بۆ خاڵی دەستپێک. ئەم وتارەی دالامبێر دەری دەخات کاتیک پایەکانی یەک شۆڕش دادەمەزرێنیت. نەوەی دواتر کۆی پایەکانی تەواو دەکات. شۆڕشی فەڕەنسی (١٧٨٩) لە ڕاستیدا تەواوکراوی نەوەی دواتر بوو. لەم پنتەوە شۆڕش بەگەرخەری مۆدێرنە بوو.

پاش ساڵی (١٧٨٩) چەمکی شۆڕش بان-مێژوویی بویەوە. تەواو ئەبستراکت دەردەکەوت لەنێو ڕیشە سروشتیەکەیدا. بەم پێیە سەلماندی کە ئەزمون و گواستنەویەکی مەزن بوو لەمێژوودا شایەنی دوبارە بوونەوەیە. بەم شێوەیە شۆڕشی فەڕەنسی مانایی ترانسێندێنتالی وەرگرت. بوو بە یەکێک لە پرانسیپەکانی کایەی مەعریفە و چالاکیە مرۆیەکان کە بەرە و شۆڕش سەر دەکێشن. لەم چرکە ساتەوە تا دواتریش پرۆسەی شۆڕش هاتە نێو ئاگاهیەوە. شۆڕشی فەڕەنسی هەم مەرجی شۆڕش بوو هەم کاریگەری هەبوو هەم کاریگەری لێدەکرا. لە پاشانیشدا هەموو مانا و دەلالەتەکانی دواتری چەمکی شۆڕش لەم پێش زەمینە بان-مێژویەوە سەرچاوەیان دەگرت.

شۆڕشی فەڕەنسای (١٧٨٩) پارێزگاری لە چەمکی ئازادی کرد. کە بڕیاربوو جیهان بەشێوەیەکی ڕۆشنگەڕانە بگۆرێت. یان بە هیوای بنیاتنانی ژێرخانێکی نوێ کە کۆی ژێرخانە کۆمەڵایەتیە کۆنەکان هەڵبوەشێنێتەوە. ئەنجومەنی نەتەوەیی ڕێکخراوە مەدەنیەکان جەختیان دەکردەوە کە دەبێت نەتەوەی نوێ لەسەر ئەم بنەمایانە دابمەزرێ. واتە ئایدیایی (ئازادی-یەکسانی-مافی مرۆڤ) کە جێگای مشتومرو گفتوگۆ کردنبوو. میرابۆ و ڕۆبسپیر و کۆندریسە یەکەم هەنگاویان نا بۆ ئاوەڵا کردنی گفتوگۆکان دەربارەی یاسا بنەڕەتیە نوێیەکان. هەروەها هەنگاونان بۆ پێکەوەبەستنی داواکاریەکان بەشێوەیەکی گشتی وەک جاڕنامەی مافەکانی مرۆڤ و مافەکانی هاووڵاتی. ئەمەش لەپەیوەندیدا بە پرسەکانی ئازادی جوڵەکەکان و ئازادی کۆیلەکان بوو. گەلی فەڕەنسی بە پەیڕەوی کردن لەم بنەمایە بۆیە چرایەک لەنێو دەریایی ئارامدا لەچاو گەلەکانی تردا.

میرابۆ لە بڵاو کراوەیەکیدا بەناوی (کۆریا دو پێرڤێنس) لە ساڵی ١٧٩٢ دا ڕایگەیاند جاڕنامەی مافە گەردوونیەکانی مرۆڤ دەبێت ڕێکبخرێت. بەپێی ئەوبنەما بنەڕەتیانەی سەبارەت بە یاسایی بنەڕەتی داهاتوو لە فەڕەنسا جێبەجێکرا. بەهەمان شێوە دەبێت لە وڵاتە کۆلۆنیزە کراوەکانیشدا جێبەجێ بکرێت. ئەنجومەنی نەتەوەیی لەپاش ئەوەی پرانسیپەکانی یاسای ئایندەیی بەتەواوی بەیانکرد. دادپەروەریترین و مەشروعیترین پەیامەکان لە داواکاریەکنیدا خرابونە ڕوو. ئەنجومەنی نەتەوەیی داوایان کردبوو کە لە فەڕەنسا و کۆی ئەو دەوڵەتانەی کە شوێنکەوتەی یاسای فەڕەنسان،



هیچ مرۆڤیک بوونی نیە جگە لە مرۆڤی ئازاد، مرۆڤەکان هەموان یەکسانن.

رۆبسپیر لە مانگی مەی ساڵی -١٧٩٣- لە بەناو بانگترین گووتەکانیدا دەربارەی یاسای بنەرەتی شۆرش رایگەیاند: مرۆڤ بە ئازادی و شادیەوە لەدایکدەبێت بەلام لە هەموو جێگایەک بەند و ناشادە. ئامانجی کۆمەلگا بەدەستهێنانی ماف و بە بالا گەیشتنی مرۆڤە. بەلام هەموو شوێنێکی کۆمەڵگا بێبەشی دەکەن و ستەمی لێدەکەن. وەختێک تاکە تاکەمان بەهای راستەقینەی مرۆڤ دەزانین. عەقلی مرۆڤ گەشەدەکات و دەبێتەهۆی سازکردنی شۆرشێکی ئاوا مەزن. ئەرکی هەموان وەگەرخستن و گوژم بەخشینە بەم بنەمایە.

مانگێک پاش ئەوە کۆندریسە لە ئەنجومەنی یاسادانان لە گووتەکانیدا پەیامێکی هاوشێوەی راگەیاند. گووتی؛ وشەی شۆرش تایبەتە بەو شۆرشانەی کە لە هەناوی ئامانجەکانیاندا ئازادیان هەڵگرتوە. یاسای شۆرش یاسایەکە بۆ پاریزگاری کردن لە شۆرش و بەگەرخستن و دیسپلینکردنی رەوتی شۆرش. بە پێی ئەم بەلگانە ئایدیای ئازادی و چالاکی مرۆڤ لە بەرگەرخستن و بەدەستهێنانی ئامانجەکان پێکەوە گرێدراون. بەم پێیە شۆرش رۆژمێرێکی بنەرەتی دەستپێکێکی نوێی خستە روو.

بۆ رۆبسپیر و کۆندریسە گوژم بەخشین بە قۆغەکانی مێژوو ئەرکی مرۆڤگەلێکە کە رووبەروی سەردەمانێک دەرۆن کە تێیدا ئازادی و خۆشبەختی تێدا فەراهەم بێت. رۆبسپیر و کۆندریسە لە گوتارەکانیاندا بۆ هاونیشتمانیانی فەرەنسی جەختی تەواو دەکەنەوە لە زەرورەتی گوژم بەخشین بە بزاوتی شۆرشی فەرەنسی. بە مەبەستی هەرچی خێراتر بەدەست هێنانی ئازادی لە رێگای نیشانەکانی بە سیکۆلاری بوونەوە. کە ئومێدی پاشە رۆژە.

ئەم روانگە مێژوویە ئێمەی گەیاندە شوێنێک کە مێژووی ئەوروپا بۆ سێ قۆناخ دابەش بکەین(کۆن، ناوەند، مۆدێرن). شۆرشی فەرەنسی ساڵی ١٧٨٩ دەستپێکی مۆدێرنەبوو. کە بەر ئەنجامی سێ پرانسیپ( ئیرادەی عەقلانی، ئازادی مرۆڤ، شکۆمەندی نەفس)بوو. شۆرشی فەرەنسی پێشرەوی ئاگاهی سەردەمەکەی بوو. لەبەرامبەر جیهانی کۆندا شێوەی بەخۆی دەدا. لەم رێگایەوە جیهانبینی خۆی بنیاتنا. لە بەرئەنجامدا گۆرینی سەردەمی کۆن بوو بۆ نوێ. .شۆرشگێرەکان ئاگاهیەکی فراوانیان هەبوو لە ئامانجیاندا بۆ دارمانی دەسەلاتی کۆن لە رابردودا. فۆرمێکی نوێیان لەبەیانکردنی باوەرەکانیان پێکهێنا. لە بەیاننامەکان دەربارەی ماف، بەیانامەکان کە پێکهاتبوو لەسەر بنەمای فۆرمولەکردنی یاسای چاکسازی گرفتەکان. لەپاشدا ئەمە گوێزانەوەی کۆنبوو بۆ نوێ. لە شۆرشی سیاسیەوە بۆ شۆرشی کۆمەلایەتی. ئاماژەبوو بۆ چەمکی مۆدێرنی

شۆرش. بە پێی ئەم بنەمایە کۆتا ئامانجی شۆرشی سیاسی دەبێت ئازادکردنی جۆری مرۆڤ بێت. بەوشێوەیەی کە دەبێت گۆرانکاری بێت لە بونیادی کۆمەڵگادا. ئەم بنەمایە بۆ کۆتایەکانی سەدەی ١٨ نوێ بوو. هەر وەک جارنامەی مافەکانی مرۆڤ و هاوولاتی. لە ساڵی ١٧٨٩-١٧٩٣ هیوا و ئامانجی رادیکاڵی شۆرشی فەرەنسا بوو بۆ بنەبرکردن و هەڵوەشاندنەوەی هەموو فۆرمەکانی کۆیلایەتی و بەکارهێنانی خراپی توانا مرۆیەکان. زۆربەی ئاراستەکانی چاکسازی بە یاسایی کردنی ئازادی و یەکسانی بوو. یان فەراهەمکردنی هەردوکیان. شۆرش لە رێگەی ئەم روانگەیەوە لەرووی شوێنەوە پێگەیەکی جیهانی وەرگرت. لەرووی کاتەوە وابەستەی ئەوەبوو بەردەوام و هەمیشەیی بێت بۆ ئەوەی ئامانجەکانی بەدەست بهێنێت.

رۆبسپیر دەنوسێت(سروشت پێمان دەلێت مرۆڤ بۆ ئازادی لەدایکدەبێت. ئەزموونەکانی قۆناغە مێژویەکان پێمان نیشان دەدات مرۆڤ دەبیاتەوە. مافەکانی لە دلیدا نوسراوە. لە مێژوودا سوکایەتی پێکراوە..... هەر بۆیە جیهانی گۆریوە.) دەبێت پێش هەر گۆرانکاریەک، هەموشتێک لەرووی مادیەوە بگۆرێت. هەموشتێک لە سیستەمی ئاکاری و سیاسیدا بگۆرێت. نیوەی شۆرشی جیهان روویداوە. دەبێت نیوەکەی دیکەشی تەواوبکرێت. درێژەپێدان بەم بنەمایانە بۆیە هۆی ئەوەی دەوڵەتی شۆرش رایبگەیەنێت(شۆرشی فەرەنسی جەنگی ئازادیە بەرامبەر بە دوژمنانی ئازادی). ئەم رستەیە وابەستەبوو بە پابەند بوونی تەواوەتی جیهان لە راوایەتی بەخشین بە شۆرش و بەردەوامی پێدانی کە لەسەر پایەکانی ئازادی وەستابوو. شۆرشێک کە خودی ئامانجەکەی وابەستەی ئازادی مرۆڤە، هۆکاری سەرهەڵدانی سەردەمێکی نوێیە . پێشوازی لە تاکی نوێ دەکات. ئەم ئایدیا مۆدێرنەی ئازادی دەستپێکی نەریتێکی نوێ بوو بۆ چەمکی شۆرش.

* (جێگای ئاماژەیە کە، ئەم بابەتە لە لاپەری چەپی نوێ و لەسەر ئێزنی بەرێزیان وەرگیراوە. رێنووسی بابەتەکە تایبەتە بە ئەوان و چەند شوێنێکی تایبەت نەبێت کە هەستمان بە ئەگەری هەڵە تێگەیشتنی خوێنەرمان دەکرد، بەم هۆیەوە وشەکەمان بە رێزمانی خۆمان گواستەوە.)

## دستمزد را چه کسی تعیین می‌کند؟

نشریه‌ی دانشجویی پایدیا

**مقدمه**

اپیدمی ویروس کرونا موجب تصویری تعلیق گونه اما نه به طور «تام و تمام» ولی به صورتی «جهان گستر» پیش روی چشمان ما شده است. جهان‌گستری این اپیدمی فقط از آن جهت نیست که ویروسی به شدت مسری است بلکه از آن جهت است که از مدت‌ها قبل مناسبات سرمایه، جهان ما را به هزاران شکل به یکدیگر مرتبط ساخته؛ چه از جهت زنجیره‌های تولیدی و چه از جهت تجارت جهانی و صدور سرمایه و کالا. پس این سرمایه است که مشخص میکند ویژگی های بالقوه این ویروس در مسری بودن، شکلی جهانی به خود بگیرد. اما تام و تمام نبودن تعلیق جامعه هم خصلتی‌ست که نه از این ویروس بلکه از مواجهه‌ی دولت‌های سرمایه با این ویروس حاصل گشته است. بسیاری از دولت‌ها از روز اول بر مسأله «کسب و کارها» و صدماتی که به آن‌ها وارد میشود تأکید بسیاری داشتند. دانشگاه‌ها و مدارس، پارلمان‌ها، بخش قابل توجهی از سازمان‌های دولتی به سهولت و در همان گام‌های اول یا تعطیل شده و یا فعالیتشان به حد ناچیزی کاهش یافت؛ آن بخشی از جامعه که به خرج بقیه جامعه زندگی می‌کرد به حاشیه خانه‌ها رانده شد. اما این کسب و کارها، این محل‌های استثمار نیروی کار و منشأ ثروت جامعه بودند که باید به کار ادامه می‌دادند. آن‌هم تنها ضروری‌ترین این محل‌ها، آن‌هایی که با تولید ضروری‌ترین کالاهای مورد نیاز جامعه سر و کار داشتند. از سمت دیگر بخش عظیمی از ابزار تولید، نیروی کار، ساختمان و تجهیزات جامعه در گوشه‌ای بی‌استفاده مانده‌اند و آن ابزاری که تا دیروز موجب خلق درآمدی بود که نه تنها در بازتولید و جایگزینی خودش به کار می‌آمد بلکه به واسطه‌ی استثمار نیروی کار ارزش جدید و سودی را برای سرمایه به ارمغان می‌آورد امروز چونان هزینه‌ای به نظر می‌آید که کسی باید پرداختش کند تا با پایان این بیماری امکان از سرگیری استثمار نیروی کار دوباره مهیا شود.

این که چه کسانی هزینه این دوران را خواهند پرداخت را نتیجه جنگ پیش رو مشخص خواهد کرد. هزینه‌ی این دوران موجب تشدید و تسریع در فرآیند بحران جهانی سرمایه خواهد بود و خود این تشدید مبارزه طبقاتی و تشدید نزاع میان دولت‌ها را در پی خواهد داشت.

فردای این کمک‌های بشر دوستانه، این وحدت جامعه انسانی علیه کرونا آنچه روی خواهد داد تشدید جنگ تجاری چین و آمریکا و خودنمایی بیشتر تناقضات در اتحادیه اروپا و ... و از سوی دیگر حمله به معیشت نیروی کار توسط سرمایه‌داران و دولت‌هایشان خواهد بود تا همه یقین حاصل کنند وحدت بشریت در جامعه طبقاتی تنها وهمی برای فریب طبقه کارگر است و نه چیزی بیشتر. در کشور خودمان نیز دولت با میلیاردها تومان کمک به سرمایه‌های بزرگ که در مقابل کمکی کمتر از میزان بخور و نمیر به زحمتکشان جامعه چونان کاخی در مقابل کومه ویران است، کار بازتوزیع ثروت به نفع سرمایه را کلید زده است.

دستمزد کارگران هم چونان عامل مهمی در وضعیت معیشت آنان و چونان هزینه برای سرمایه‌داران گره‌گاه مهمی در این نزاع همیشه در جریان است. آنچه این روزها پیرامون این مسأله رخ میدهد تعلیق و به گرو گرفتن افزایش حداقل دستمزد کارگران است تا اولاً چندماه اول سال نرخ دستمزد همان نرخ مصوب اسفند سال قبل (۹۷) باشد و این خود کمکی‌ست از جانب شورای تعیین به جیب سرمایه‌داران و ثانیاً هرچند به‌هنگام سود شراکتی وجود ندارد اما هزینه‌های این دوران باید مشخص شود تا بشود فهمید چه مقدار باید از جیب کارگران بیرون کشید. وقایع اخیر ما را برآن داشته تا به تحلیل مزد در جامعه سرمایه‌داری به‌طور کلی و سپس به تحلیل این مسأله در شرایط ویژه جغرافیایی و تاریخی خودمان بنشینیم.




**مختصری پیرامون جایگاه مزد در نظم سرمایه**

تولید بورژوایی از سلول‌های مجزا از همی تشکیل می‌گردد که هرکدام از آن‌ها در انتهای فرآیند تولید کالایی تولید می‌کنند که بیش از ارزش مجموع کالاهایی که در تولید آن نقش داشته‌اند می‌ارزد. این مقدار به عنوان سود این سلول تولیدی نصیب عامل انسانی که این مجموعه را به کار انداخته یعنی سرمایه‌دار می‌گردد. سود انگیزه‌ی اساسی است که به ساختمان این فرآیند شکل خاصی می‌بخشد. اما منشأ این سود چیست؟ در ابتدای



چاودێریکردنی (مۆنیتۆرکردنی) خۆیان. ئەمەش لە ئاکامدا دەیانخاتە دڵەڕاوکێ و کێشەی دەروونی و ڕووخانەوە. هەندێک لە ژنان بە پەنابردن بۆ کاڵای زۆر و بەرخۆریی و کەلوپەلی مارکە و نەشتەرگەری جوانکاری هەوڵدەدەن ئەو ستانداردە لە سێکسیبوون و گەنج مانەوە و جوانی مسۆگەر بکەن. گرنگە لەوە تێبگەین کە ژنان بەهۆی فشارێکی زۆر لەسەریان بۆ گەیشتن بەو فیگور و وێنایە لە جەستەی ئێدیاڵ، ناچارن زۆر ڕێگا بگرنەبەر کە یەکێکیان نەشتەرگەری جوانکارییە. بەڵام پرسیار لێرەدا ئەوەیە- بۆ ژنان لەژێر ئەم فشارەدان بۆ گەیشتن بەو ئێدیاڵە خوازراوە؟

لەوە تێدەگەین کە پیاو لێرەدا سەنتەرە و ئەوە کە دامودەزگاکانی ماس میدیا و بەرهەمهێنانی کولتووری، حیزب و ژیانی دەرەوەی ماڵی بەدەستەوەیە. کەواتە ئەوە پیاوە لەم ڕێگایانەوە وێنای ئێدیاڵی ژن و جەستە و (سێکسی – بوون) و گەنج مانەوەی ژن بانگەشە دەکات. لەمەوە گووتە گرنگەکەی (جۆن بێرجەر) بیریار، نوسەر و ڕەخنەگری هونەری بەناوبانگی بەریتانیمان بیردەکەوێتەوە کە دەڵێت "پیاوان لە ژنان دەڕوان، ژنان چاودێری خۆیان دەکەن کە سەیر دەکرێن. ئەمەش دیاریکەری، نەک تەنها زۆربەی پەیوەندیەکانی پیاو و ژنە، بەڵکو پەیوەندی ژنە بە خۆیشیەوە."[٦].

بە واتایەکی تر؛ ئەم ڕوانینەی پیاو بۆ ژن، کە سێکسوالییە، ژن دەخاتە بەردەم دڵەڕاوکێیی بەردەوام و خۆسانسۆرکردن و خۆچاودێریکردن. وەها دەکات ژن هەست بە ئاسوودەیی و بوونێکی کامڵ نەکات، بەڵکو هەمیشە بە هەستیاریی دەمێنێتەوە لەسەر چاودێریکردنی خۆی و کردار و ڕووخساری، بۆ نموونە؛ کاتێک ژنان لەسەر شەقامەکان و ناو بازاڕدا پیاوان هەراسیان دەکەن، یان تانە و تەشەریان لێدەدەن لەسەر ڕووخسار و جەستەیان، ئەمە لای ژن دڵەراوکێ دروست دەکات. لێرەدا ژن ڕووبەڕووی ئەو ڕاستییە تاڵە دەبێتەوە کە تا چ ڕادەیەک جەستەی ئەم جێگەی ڕوانینی بەردەوامە لەلایەن پیاوەوە.

بەهۆی ئەوەی ژنان بە هەوڵێکی زۆر و سەختییەوە توانیویانە بێنە فەزای گشتی و ژیانی کولتووری و سیاسیەوە، هەر بۆیەش خواست و داواکاری زۆر لەسەر هەموو هەڵسوکەوت و ڕووخسار و گفتوگۆکردن و کارکردنیان هەیە. کاتێک کۆی ئابووری وڵات لە دەستی پیاواندا بێت و سترەکتووری دەسەڵات لەسەر پیاوگەرایی وەستابێت، ژنان دەکەونە دەرەوەی یەکسانی ئابوورییەوە؛ لێرەوە ڕۆڵی ئەوان بەهەند وەرناگیرێت. هەروەک فێمینیست و نووسەر (نایۆمی ۆولف)[٧]، لە کتێبی (وەهمی جوانیدا) باس لەوە دەکات کە "(...) لەلایەک ژنان بەهۆی نەبوونی هۆشیاری و دڵەڕاوکێوە دەکەونە داوی ئەوەی لە درۆی 'وەهمی جوانیدا' جێگایان بێتەوە، بەردەوامی بدەن بەم درۆیە. لەلایەکی تریشەوە، پێویستیی ئابووری زامنی ئەمە دەکات. ئابوورییەک کە لەسەر کۆیلەداری وەستاوە و پێویستی بەوەیە بەردەوام جەخت لەسەر وێنای کۆیلەکە بکاتەوە بۆئەوەی شەرعیەت بە بوونی دامودەزگای کۆیلەدارییەکەی بداتەوە.". هەروەها (نایۆمی ۆولف) باس لەوە دەکات کە "(...) ئابووری وڵاتانی خۆرئاوا پشتبەستووە بەوەی کە مووچەی کەمتر بە ژنان بدەن. ئەمەش بە ئایدیۆلۆژییەک دادەنێت کە وەها لە ژنان دەکات (بێبەها) لە خۆیان بڕوانن..."؛ لەوەش زیاتر لەو باوەڕەدایە کە "(...) ئابووری خۆرئاوا پشت بەستووە بە وێناکردنی ژنان لەوەهمی جوانیدا...". هەرچەندە ئەم کتێبە لەنەوەدەکانی سەدەی بیستدا نووسراوە، بەڵام تا ئەمڕۆش زۆرێک لە باسەکانی گونجاوە.

لە کوردستانی باشووردا لاسەنگی ئابووری و سیاسی لە هەموو کایەکاندا بەرچاوە و ئەمەش وایکردوە ئامادەیی ژن پابەند بێت بە کۆمەڵێک دەستکاریکردنی جەستە و ڕووخسار و هەڵسوکەوتەوە. لە لایەکەوە، هێزە کۆنەپارێزەکان خوازیار و هاندەری باڵاپۆشین، لە لایەکی ترەوە سیاسەتمەداران و سەرمایەدارانی نیولیبراڵ خوازیاری داماڵینی ژنانن لەهەموو بەهایەک و کورتکردنەوەیان بۆ کاڵایەکی سێکسی؛ بەجۆرێک بوونی ژنی جوان و گەنج و سێکسی لەبەر چاویاندا ڕۆژانە وەک جۆرێک لە بەرخۆری لێهاتووە.

پەراوێزخستن و دوورخستنەوەی ژن لە (بونەوەرێکی تەواو) وخاوەن کەسایەتییەوە و کورتکردنەوەی بۆ جەستە، لاسەنگیی لە هێزدا دروستدەکات. لەلایەک نیوەی کۆمەڵگە کورتدەکرێتەوە بۆ ئامرازێکی سێکسی و لەلایەکی ترەوە نیوەکەی تری کە پیاوە، بۆ تەماشاکار و لێڕوانەری پیاوگەرا. گرنگە لێرەوە کار بۆ (دادپەروەری جێندەری) بکرێت، بەوەی ئەم هێرشە پۆرنۆیی و نەشتەرگەرییە نیۆلیبراڵییە، بە پەرەپێدانی هۆشیاری و بەهێزکردنی ژنان لە ڕێگەی زانست و فیکری فێمینیستییەوە، بەرپەرچبدرێتەوە. لەڕێگای خۆڕێکخستنی خۆڕسکانەوە و سەربەخۆوە دەبێت کە بەرپەرچی ئەم بەکاڵابوونەوەی ژنان و هەموو فۆرمەکانی چەوسانەوەی ژن بداتەوە.
لێرەدا پێویستە ئەوە بڵێین، کە نابێت ژنی کورد لەو وەهمەدا بژی کە دەتوانێت لە ڕێگەی کۆمەڵێک (ئێن جی ئۆ) و ڕێکخراوی دروستکراوی حیزبی ژنانەوە خەبات بۆ مافەکانی بکات. ئەمانە لەڕاستیدا وەک چینێکی ئۆروستوکراتی وەهان کە لەنێوان کۆی ژنانی کۆمەڵگە و دەسەڵاتدا وەستاون. بە جۆرێک، کە مەرگ و سووتاندن و کوشتنی ڕۆژانەی ژنان جۆرێکە لە دەرامەت و سەرچاوەی مووچە بۆ ژمارەیەکی کەم لە ژنان لە ڕێکخراوەکان و حیزبەکان و پەرلەمان و حکومەتدا.

زۆرینەی ژنانی چەوساوەی کورد گرنگە وەک چینێکی دووجار زوڵملێکراو خۆیان ڕێک بخەن و خەباتی خۆیان بە پشتبەستن بە هۆشمەندی و دونیابینی ژنانە بەهێز بکەن. ژنانی کارمەندی ڕێکخراوەکان و (ئێن جی ئۆکان) بە جیهانی و لۆکالیشەوە، خاوەنی دونیابینیی ژنانە نین و هیچ کات ناتوانن پێشڕەوی هیچ بزوتنەوەیەک بکەن... ئەوەی دەمێنێتەوە و گرنگە وەک ژن لەبیرمان نەچێت، ئەویش ئەوەیە، کە نەهێڵین هیچ کەس و لایەنێک سازش بە ماف و داواکاریەکانی ژنانەوە بکات. دادپەروەری کۆمەڵایەتی و جێندەری دەستەبەر نابێت، گەر بێتو زۆرینەی ژنان بێدەنگ بن و ڕێگە بدەن ژمارەیەکی کەم لە ژن بەناوی ئەوانەوە پلەو پایە بۆخۆیان فەراهەم بکەن.

یەکێک لەهەنگاوە هەرەگرنگەکان لەم قۆناغەدا، خۆڕێکخستنی خۆڕسکانەی ژنانە لەدەرەوەی ڕێکخراوەکانی ژنان وحیزبەکان. لێرەوە دروستبوونی (جڤاتی ژنان) لە پەیوەند بە داواکارییە هەنووکییەکانەوە ودیالۆگکردن ودارشتنەوەی ستراتیژی کارکردن، چ لەڕووی گۆڕینی یاساکانەوە، چ لەڕووی کرداری خۆپیشاندانەوە، تاوەکو دەگاتە داڕشتنەوەی لە گوتارێکی سیاسی ژنانە، بەدونیابینی وهۆشمەندییەکی ژنانەوە، گرنگییەکی مێژوویی خۆی هەیە بۆ دروستبوونی بزوتنەوەیەکی ڕاستەقینەی ژنان لەکوردستاندا.

لەندەن – دیسێمبەر ٢٠١٨

**پەراوێز و سەرچاوەکان:**


Marx, K., Capital, vols. i and iii (New York: International Publishers, ١٩٦٧). Theories of Surplus Value, pt. ٢ (London: Lawrence & Wishart, ١٩٦٩).

Dolezal، (٢٠١٠). The (in)visible body: Feminism، phenomenology، and the case of cosmetic surgery. Hypatia ٣٥٧ ،(٢)٢٥.

Foucault، (١٩٨٠: p١٨٦). Power/Knowledge: Selected interviews and other writings، ١٩٧٧-١٩٧٢، (Ed.) Colin Gordon، trans. Colin Gordon، Leo Marshall، John Mepham، and Kate Soper، Brighton: Harvester Press.

Mulvey، Laura (١٩٩٩: p٤٤-٨٣٣) “Visual Pleasure and Narrative Cinema.” Film Theory and Criticism: Introductory Readings. Eds. Leo Braudy and Marshall Cohen. New York: Oxford UP،.

Fredrickson، Barbara and Roberts، Tomi-Ann،” (١٩٩، p-١٧٣ ٢٠٦) Objectification Theory: Toward Understanding Women’s Lived Experiences and Mental Health Risks.” Psychology of Women Quarterly، ٢١ ، USA

Berger، (١٩٧٣: p٤٧) Ways of Seeing. London: Penguin Books.

Wolf، (١٩٩١: p١٨).The Beauty myth: how images of beauty are used against women. London: Vintage.



**سپاس بۆ لاپەڕەی کولتور مەگەزین،**
**کە ئیزنی بڵاوکردنەوەی ئەم بابەتەی بە ئێمە بەخشی.**




وێنەی وەرگیراو لە لاپەڕەی ئینستاگرامی filmisculture@

# «نا-هاوچەرخبوون»ی هونەرمەندانی سەردەم

**پەیمان عەلیپوور**

بێگومان دەسکەوەتەکانی «مۆدێرنە»، تەنیا بە گەشەکردن و پەرەسەندنی «ئەقڵی زانستی»ـەوە سنووردار ناکرێن و «چەمکی هونەر»یش یەکێک لە داهێنانەکانی ئەوە؛ بەجۆرێک کە ڕێگە خۆشکەربوو هەتا هونەر، پرسیارێک بێت لەپێناو خودی خۆیدا. چونکە هونەری مۆدێرن، لە جەوهەری خۆیدا چییەتییەکی بۆرژوازی هەیە، واتا هونەرمەند لە دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکانی وەک کڵێسا و دەرەبەگایەتی و خانەدانەکان دادەبڕێت و دەبێتە بە بەرهەمهێنەرێکی لاتەریک، کە لەپێناو بەردەنگ یان کڕیار بەرهەمی هونەری خۆی بەرهەمدەهێنێت.

بەڵام هونەری ئەورۆکە، داگەڕاوە بۆ ئەزمونکردنی هونەر لە مانا ڕەهاکەی خۆیدا، بەچەشنێک کە حاشا لە گشت خزمایەتییە مێژوویی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسییەکانی خۆی دەکات. ڕوون و ئاشکرایە کە کاری هونەری جیاوازە لە هۆشیاری بەئانقەست، بەڵام هەر ئەم جیاوازییەشە ورەی ئەوەمان پێدەبەخشێت کە لەم ساتەوەختەدا کە «جیهان» شەڵاڵی خوێن و نوقمی خەمۆکی و لە ئاویلکەدانی ئیرادە دایە، پرسیارەکەی ئادۆرنۆ لە وتاری «ئیلتزام»دا، دووبارە بوروژێنینەوە: «ئایا هیچ هونەرێک ئێستاکە مافی ئەوەی هەیە کە بوونی هەبێت؟»[١].

ئەوەی ڕاست بێت ئەم پرسیارە ڕووی ڕاستەقینەی لە هونەر و هونەرمەندانە، چونکە هەڵقوڵاوی ناخی ئەو سەربەخۆییەیە کە مۆدێرنە پێشکەشیکردون. بەڵام لەسونگەی بیر و بۆچوونی کۆمەڵێک ڕەخنەگری وەکو ڤاڵتەر بنیامین و بێرتۆڵد برێخت- کە هونەر بۆ ئەوان لە پلەی یەکەمدا کردەوەیەکی کۆمەڵایەتییە نەک بابەتێک بۆ توێکاری و شیتەڵکاری ئاکادیمیا- ئەگەر بێتو لە دێڕە بەناوبانگەکەی نیچە لەپێشەکی نامیلکەی «دەربارەی سوودەکان و زیانەکانی مێژوو بۆ ژیان»ـەوە، لەجیاتی «مێژوو» هونەر و لەباتی «مەعریفە» جوانیناسی دانێین و دووبارە دایرێژینەوە، ئەوە دەتوانین لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا بڵێین: «بەدڵنیاییەوە ئێمە پێویستیمان بە هونەرە، بەڵام پێویستی ئێمە جیاوازە لە پێویستی، خوێڕییە بەنازوونووزە بەرەڵاکانی نێو باخی جوانیناسی»[٢]...چونکە ئەو دەمەی کە «ڕۆشنگەری» بێزووی بەمۆدێرنە دەکرد، دووگیانی کۆرپەلەیەک بوو کە ئەورۆکە بۆتە زەلامێکی زەبەلاح بە ناوی «فاشیزم»، کە ڕێگەمان نادات چی تر هەروا بە سووک و سادەیی لەڕوانگەی جوانیناسیەوە سەیری هونەر بکەین.



**ئالان بادیۆ؛ هونەر لەپێناو دۆزینەوەی سوبێکتێکی نوێ !**

ڕەنگە هەربۆیەش (ئالان بادیۆ) لە سیمینارێک بە ناونشانی «سوبێکتی هونەر»دا دەڵێت: «زۆر جاران، ئەو دەمەی کە پێناسە و جێکەوتەیی سیاسەت لێڵ و ناڕوونە، پێناسە هونەرییەکان بارودۆخەکە ڕووندەکەنەوە»[٣] و لە کۆتایی قسەکانیشیدا زەرووڕەتی هەبوونی هونەر دەبەستێتەوە بە بەرپرسیارێتی هونەر لە ڕۆژگاری ئێمەدا و دەڵێت: «بەڕاستی ئەورۆکە، بەرپرسیاریەتییەکی دیاریکراو و تایبەت بۆ ئافراندنی هونەری لەئارادایە، ئەویش یارمەتیدانی مرۆڤایەتییە، لەپێناو دۆزینەوەی پارادایمی سوبێکتیڤیی نوێ»[٤].

بەڵام پێشمەرج یان هەنگاوی یەکەمی ئەم «بەهانای مرۆڤایەتی هاتن»ـە، ئەوەیە کە هونەرمەند لەپێشدا پەیوەندیەکی تاقانە و دەگمەن لەگەڵ «سەردەم» و «سەرووبەند»ی خۆیدا درووستبکات، هەمان ئەو پەیوەندییەی کە جۆرجۆ ئاگامبێن ناوی دەنێت «هاوچەرخبوون». ئاگامبێن لە وانە-لێدوانی کرانەوەی بەشی فەلسەفەی تیۆریک، لە زانکۆی IUAV لە ساڵی ٢٠٠٥دا دەڵێت: «هاوچەرخ، ئەو کەسەیە کە بەشێوەیەکی توندوتۆڵ چاو لە کات و سەردەمی خۆی دەبڕێت، نەک بۆ بینین و هەستکردن بە ڕووناکی، بەڵکو لەپێناو تێبینیکردنی تاریکیدا»[٥].

ئەم چاوبڕینە لە ئەنگوستەچاویی سەردەم، فڕی بەسەر ڕەشبینی بوونگەرایانە و دۆشداماوی عاریفانە و خەمۆکی دەروونناسانە و ناچالاکبوونی دەستوپێ سپیلکانەوە نییە. ئاگامبێن بە یارمەتی فیزیۆلۆژی دەمارەکانی بینین، نیشانماندەدات کە «بینینی تاریکی» یەکسان نیە لەگەڵ «نابینابوون» و «نەبینین»، بەڵکوو «نەبوونی ڕووناکیی» دەبێتە هۆی وەکارکەوتنی کۆمەڵێک خانەی نێو تۆڕینەی چاو بە ناوی off-cell کە دەستدەکەن بە چالاکی و چەشنێکی تایبەت لە سۆما و بینایی دێنە ئاراوە کە

مرۆڤ پێیدەڵێت «تاریکی». کەوایە درکپێکردن بە تاریکی، چالاکییەکی سەربەخۆی پەیوەست بە بینینەوەیە و، ئەو هونەرمەندانەشی کە تەنیا ورشە و گرشە و شۆقو شەبەق و تیشکەکانی سەردەمی خۆیان دەبینن، ناکرێت ئاوڵناوی هاوچەرخبوونیان پێبدرێت، چوونکە چاویان لە بینینی بەشێکی سەردەمی خۆیان داپۆشیوە؛ جا با لە ژیانیش دابن و جا با هەموو ڕۆژێ لێرە و لەوێ چاکوخۆشیشمان لەگەڵ بکەن! هەروەک ئاگامبێن دەڵێت: «تەنیا ئەو کەسانە دەتوانن بە خۆیان بڵێن هاوچەرخ، کە ڕێگە نەدەن لەلایەن ڕووناکییەکانی سەدەوە، کوێر ببن»[٦].

هونەرمەند بۆ ئەوەی خۆی لەم کوێربوونە زۆرەملێیانەی کە سەردەم بەسەریدا دەسەپێنێت دەربازبکات، ناچارە هەستێت بە هاوتەریبنەبوون و هاورانەبوون و ناکۆکبوون و نەگونجان و دابران لە سەردەمی خۆی، هەمان ئەو شتەی کە کەم تا کورت نیچە پێیدەڵێت «نا-وەختبوون»[٧] و لەسەرەتای تێرامانی دووەمدا لە کتێبی «تێرامانە ناوەختەکان» ئاوا وەسفی دەکات: «گەڕان بە دوای تێگەیشتن لەو شتەی کە ئەم سەردەمە تەواو بەڕاستی پێی لەخۆبایی بووە، واتا کولتورە مێژووییەکەی، ئەویش وەکوو جۆرێک نەخۆشی، بێتوانایی و کەموکووری»[٨].

ئەم (ناوەختبوونە) بۆ هونەرمەند بەهیچ کلوجێک بەمانای خۆدزینەوە لە واقیعی سەردەم و خۆخزاندنە نێو نۆستالژیا و یۆتۆپیای خەیاڵی نییە، بەڵکوو لەهەمان کاتدا کە دان بەوە دادەنێت کە ڕۆڵەی سەردەمی خۆیەتی، بەڵام لەبەردەمیدا نەک سەرکزناکات و بەچۆکدانایەت بەڵکو بەهاکانی دووبارە هەڵدەسەنگێنێتەوە و سەرلەنوێ بەهامەندیان دەکاتەوە. هەربۆیە ئادۆرنۆ لە وتاری «ئاشتەوایی لەژێر زەبر و زۆریدا» دەڵێت: «هونەر مەعریفەیەکی نێگەتیڤە لە جیهانی ڕاستەقینە و بەرکار»[٩]. واتا هونەرمەند تەنها لەرێگەی جۆرێک مەوداگرتن و دووریدانان لەنێوان خۆی و جیهانی سەردەم، دەتوانێت ببێت بەهونەرمەند و بەرهەمە هونەرییەکەشی هۆشیارییەکی بایەخدار بخاتەروو. ئەگەر بمانهەوێت ئامووشۆی نێوان هاوچەرخبوون و مەعریفەی نێگەتیڤ هەستپێکراوتر بکەین، ئەوە ئاگامبێن پێماندەڵێت: «هاچەرخ کەسێکە کە تاریکی کات و سەردەمی خۆی وەکوو شتێک درکپێدەکات کە پەیوەندی بە ئەوەوە هەیە، وەکوو شتێک کە هەرگیز دەستهەڵناگرێت لە پابەندکردنی ئەو»[١٠].

لەوانەیە هەست بە، بۆکرووزی «تیۆری ڕەنگدانەوە»[١١] بکەن- ئەو تیۆرییەی کە بەرهەمی هونەری وەکو «ئاوێنە»ی ڕەنگدانەوەی چاک و خراپی واقیعی کۆمەڵگا وێنا دەکات- ڕەنگە وابزانن لێردا مەبەستی داکۆکیکردن لەم تیۆرییە لەئارادایە، ئەویش بەشێوەی شێواو و تاکرەهەند و نیوەچڵ، واتا کورتکردنەوەی ڕۆڵی بەرهەمی هونەری تەنها بە دەرخستنی دزێویی و ناشرینی و ڕەشاییەکانی سەردەم؛ بۆیە بەباشی دەزانم بۆ ڕوونبوونەوەی باسەکە پەنا بۆ بێرتۆڵد برێخت لە «ئۆرگانوونێکی کورت بۆ شانۆ»دا بەرم کە لەوێدا دەڵێت: «هەرچەند هونەر ڕەنگدانەوەی ژیانە، بەڵام ئەم کارە لەڕێگەی ئاوێنە تایبەتەکانەوە ئەنجام دەدات»[١٢]. ئەم ئاوێنە تایبەتە، شتێکی سەیروسەمەرە و بە توانایی سەرسامکەر و خاوەن تەکنۆلۆژیایەکی فرە پێشکەوتوونیە! بەڵکوو پییەر ماشێری[١٣] لە کتێبی «تیۆری بەرهەمهێنانی ئەدەبی»دا لەبارەی ئەم ئاوێنەیەدا بۆمان باسدەکات کە ئەم ئاوێنەیە، «ئاوێنەیەکی شکاوە»[١٤]! کە وێنەکانی خۆی بەشێوەی پارچە پارچە نیشاندەدات، بەجۆرێک کە لەبارەی ئەو شتەی کە تێیدا ڕەنگاداتەوە هێندەی ئەو شتەی کە تێیدا ڕەنگدەداتەوە قسەی پێیە و بۆمان دەدوێت.



ڤالتەر بنیامین ؛ هێڵکاری
Walter Bendix Schönflies Benjamin (* ١٥. Juli ١٨٩٢ in Charlottenburg; † ٢٦. September ١٩٤٠ in Portbou)
Sketches of Walter Benjamin. Credit: Renée

هەتا نەچووە کە بچێ، دەبێت ئەم هۆشداریە بچرپێنم: ئەگەر تێبنینیکردنی تاریکی، لەگەڵ «ئەپۆخە»[١٥]کردنی ڕووناکییەکان تێکەڵ بکەین، ئەوە توشی هەڵەیەکی کوشندە دەبین! لەبەرئەوەی ئەپۆخەکردن، هەڵواسین و لە کەوانە گرتنی جیهانی دەرەوەیە، کە (ئەدمۆند هوسرڵ) وەکوو یەکەم هەنگاوی ڕێبازی فینۆمینۆلۆجی خۆی لەپێناو ناسینی شتەکان لەنێو زەیندا، پێشنیاری دەکات. هوسرڵ وەکوو ئیمانوێل کانت بڕوای بە دوانەی «نۆمین و فینۆمین»[١٦] یان «هەبوون و دەرکەوت» لەمەڕ جیهانەوە هەبوو. فینۆمینۆلۆجی کانت، فرچکی بەوە گرتووە کە مرۆڤ هیچ کات دەستی بە جیهانی دەرەوە یان شتەکان خۆی لە خۆیاندا، واتە «نۆمین» ڕاناگات و هەر بۆیەش زانینی ئێمە، وابەستەی دەرکەوتە و خۆدەرخستنی جیهان یان

هەمان «فینۆمین»ـەکان لە تێگەیشتنماندا دەکات. کەچی فینۆمینۆلۆجی هوسرڵ، بۆ وەچەنگ خستنی ناسینێکی پاڵاوتراو لە خەوشێتی گومان و هەڵە، فینۆمین بەتەواوی لە نۆمین دادەماڵێت و ئاگامەندبوون لە جیهانی دەرەوە بەتەواوی بە چۆنێتی و شێوازەکانی ئامادەبوونی فینۆمین لە زەیندا دەبەستێتەوە.

لەحاڵێکدا هاوچەرخ، بە هیچ شێوەیەک بەتەما نیە دروشمە بنچینەییەکەی هوسرڵ بگۆڕێت بۆ «گەڕانەوە بۆ خودی تاریکییەکان» و هەربۆیەش هاوچەرخبوون، «تاریکیناسیی» نییە و سوبێکتی هاوچەرخیش بڕوای بەوە نیە کە تاریکی دەرکەوتە و فینۆمینی سەردەمە و بۆ ئەوەی بتوانێت بە وردی سەیری بکات، ڕووناکی وەکوو نۆمین هەڵاوەسێت و لەکەوانەی بگرێت، هەتاکوو تێبینی تاریکی لە دەرەوەی ڕوناکی و مێژوودا ئەنجام بدات. بەڵکو هاوچەرخبوون، لەڕاستیدا پتر هەوداکانی فینۆمینۆلۆجی هیگڵیانەی لە تانوپۆی خۆیدا هەڵگرتوە. کاتێک هیگڵ زاراوەی «فینۆمینۆلۆجی» بەکاردەبات، دەڕوانێتە جیهانی دەرەوەی زەین و مەبەستی ناسینی ئەوە، واتا ناسینی جیهان بەو جۆرەی کە لە دەرەوە و لە ڕەوتی مێژوویی خۆیدا بوونی هەیە؛ بۆیە دواجار ناسینی فینۆمین لای هیگڵ یەکسانە لەگەڵ ناسینی خودی نۆمین و جوداییەک لەنێوانیاندا بەدیناکرێت. سوبێکتی هاوچەرخیش لە بنەڕەتدا نیازی وایە، ئەو سەردەمەی کە تێیدا دەژیت وەکوو گشتێکی مێژوویی و ڕاستەقینە بناسێت، هەربۆیە سەردەمی خۆی وەکوو «ئاسمانی شەو» درکپێدەکات و سەیریدەکات: تاریکونوتەکییەکی ڕەبەق، ئاوێتە بە جریوە جریوی ئەستێرەکان. جا هەر بۆیە ئاگامبێن لە ئاخر و ئۆخری قسەکانیدا دەڵێت: «هاوچەرخبوون تەنیا بە واتای هەبوونی توانایی چاوتێبڕینی توندووتۆڵ و جێگیر لە تاریکییەکانی سەردەم نییە، بەڵکوو هەروەها درککردن و تێبینیکردنی ڕووناکیشە لە هەناوی ئەم تاریکییەدا، ڕووناکییەک کە لەهەمان کاتدا ئاراستەکەی بەرەو ئێمەیە، بەشێوەی ناکۆتا لە ئێمەش دوور دەکەوێتەوە»[١٧].

ئێستا دەرکەوت کە چەمکەکانی «سوبێکتیڤی نوێ»، «ناوەختبوون»، «مەعریفەی نێگەتیڤ» و «ئاوێنەی شکاو» لە وتەزای «هاوچەرخبوون»دا چڕدەبنەوە و دەپێتێندرێن؛ هەربۆیە نیازم وایە سەرکێشییەکی ناوازە بکەم و پردێک لەنێوان چەمکی «هاوچەرخبوون» و «دەربڕین»[١٨] درووست بکەم و لە هونەری مۆدێرنی سەربەخۆدا کۆنکرێتی بکەمەوە.

ئەگەر ئەرکی هونەری شێوەکاری بینراوکردنی، نەبینراوەکان و مۆسیقا دەنگدارکردنی، بێدەنگەکان و ئەدەب بە وتنکردنی، بێوتەکان... بزانین، ئەوە هەموو هونەرەکان لەیەک خاڵی بنچینەییدا یەکدەگرنەوە ئەوەیش ئەوەیە کە هونەر لە کرۆکی خۆیدا ئامرازێک یان باشترە بڵێن ناوبژیوانێک بۆ درکاندن و دەرخستن و نواندن و دواجار دەربڕینە. ئێستا ئەگەر بمانهەوێت دەربڕین تێکەڵکێشی هاوچەرخبوون بکەین ئەوە بێئەملاوئەولا، توشمان بەتوشی کەسێک دەبێت کە ناوی «ساموێل بێکێت»ە! ئەو کەسەی کە دەربڕین، هەڵدەلووشێتە نێو ناخی «سەردەم» و «هونەر» لەیەک ئانوساتدا و ڕادیکاڵی دەکاتەوە، بەچەشنێک کە دەربڕین دەکاتە بە «کێشە»یەکی جەوهەری دوو جەمسەری سەردەم و هونەر و شان بە شانی یەک ئێشیان لەسەر دەکات.



سوریالیزم ؛ دالی ؛ئۆرکێستڕای سوور

بێکێت، لەساڵی ١٩٤٩ لەمیانەی «سێ وتووێژ» لەگەڵ (ژۆرژ دووتویی)دا، بەم شێوەیە ئەم پرسە گەڵاڵە دەکات و دەڵێت؛ هونەرمەندی سەردەمی ئێمە چارەی ناچارە کە ملبدات بە: «ئەم دەربڕینە، کە هیچ شتێک بۆ دەربڕین لەئارادا نەماوە، نە هیچ شتێک کە لەرێگەی ئەو بتوانین دەربڕین ئەنجام بدەین، نەهیچ شتێک کە لەبارەی ئەودا دەربڕین بکەین، نە هێزو دەسەڵاتێک بۆ دەربڕین، نە مەیل و ئارەزوویەک بۆ دەربڕین، وێڕای ناچاربوون و پابەندبوون بە دەربڕین»[١٩].

پوختە یان فۆرموولەکراوی ئەم وتەیە دەبێتە ئەوە کە، هونەرمەند ئەو کەسەیە «هیچ نەمان بۆ دەربڕین» و «ناچاربوون بەدەربڕین» تێکەڵکێشی یەکدی دەکات و «دەریدەبڕێت». ئەمە لەهەقیقەتدا شۆڕکردنەوەی مۆرکەکانی هاوچەرخبوون، بۆ نێو جەرگ و دڵی هونەر و هونەرمەند و بەرهەمی هونەرییە.

لێرەدا زایەڵەی تیژە بەپێزەکەی ڤالتەر بنیامین لە گوێچکەی مێشکمدا دەنگدەداتەوە! بنیامین لە لێدوانێکدا کە لە ئەنیستیتۆی توێژینەوە لەسەر فاشیزم، لە ٢٧ی نیسانی ١٩٣٤ لە پاریس، بەناونیشانی «نوسەر/ هونەرمەند وەکوو بەرهەمهێنەر» پێشکەشیکرد، دەڵێت: «لەباتی ئەوەی بپرسم: شەقڵی پیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی سەردەم لەسەر

[بەرهەمی هونەری] چۆنە؟ نیازم وایە بپرسم: پێگە و هەڵوێستەی ئەم لەنێو ئەودا چۆنە؟»[٢٠].

بەزمانێکی بێگرێوگۆڵ بنیامین بەتەمایە واز لەو پرسیارە باوە بێنێت کە لە خزمایەتی نێوان بەرهەمی هونەری و پەیوەندیە کۆمەڵایەتییەکانی بەرهەمهێنانی سەردەم دەکۆڵێتەوە و دەیەوێت بەرزتر هەڵکشێت و پرسیار لە هەڵوێست و هۆشیاری بەرهەمی هۆنەری لەنێو ئەو پەیوەندیانەدا بکات. بنیامین لەجیاتی ئەوەی لەنێو خودی بەرهەمی هونەری بەدوای نواندنەوەی هەڵوێستی سیاسیدا بگەڕێت، خودی بەرهەمەکە دەکاتە بەدیاردەیەکی سیاسی. ئەمە پەلدەهاوێژێت بۆ لێپرسینەوە لە تەکنیکی هونەری یان بەزمانی بێکێت، دەربڕینی هونەری. چونکە بنیامین پێیوایە کە (هونەر وەکو بەرهەمهێنان) دەبێت ناتەبایی و ناکۆکیی خۆی لەگەڵ تاریکییەکانی سەردەم کە بنیامین پێیدەڵێت (پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنانی سەردەم) جگە لەناوەڕۆکدا، لە شێوازی بەرهەمهێنانی هونەریشدا دەربخات.



سامۆیل بیکێت
Samuel Barclay Beckett ١٣ April ٢٢ – ١٩٠٦ December ١٩٨٩)

واتا هونەرمەند وەکو بەرهەمهێنەر لەباتی نامۆبوون لە بەرهەمە هونەرییەکەی، دەبێت پەیوەندیەکی ئاگامەندانەی مێژوویی لەگەڵداهەبێت. هەربۆیە هونەرمەندی نموونەیی بنیامین، «برێخت»ـە، ئەو هونەرمەندەی کە لەپێناو پڕشەنگدانەوەی تروسکەی قەتیسماو لەنێو تاریکەسەلاتی سەردەمدا، شێوازەکانی بەرهەمهێنانی شانۆگەری بەتەواویی گۆڕی. کەوابوو هونەرمەندی هاوچەرخ ئەوکەسە نیە کە بە سەردەمی خۆی سەرسام بێت، بەڵکو ئەوەندە ئازایە کە سەردەمی خۆی سەرسامدەکات؛ ئەگەر چی لە خەوی مێژوو بەخەبەر هاتووەتەوە بەڵام چاک دەزانێت کە مێژوو دوایی پێنەهاتووە؛ هەربۆیەش تاریکیەکانی سەردەمی خۆی وەکو شتێک سەیردەکات کە پەیوەندی بەئەوەوە هەیە، بەجۆرێک کە بێوچان داوای «ڕووناکبوونەوە»ی لێدەکەن؛ جا هونەرمەندی هاوچەرخ، لە ئەوپەڕی خۆیدا جگە لەوەی سەردەکەوێت کە چاوی بە «سەردەم»ی خۆی بکەوێت، دواجار بەرچاو ڕوونیش بە «ئێمە» دەبەخشێت و هەلی دیداری ئێمەش لەگەڵ «سەردەم»دا دەرەخسێنێت.

تەواو

----------------------------------------------------------------

**سەرچاوە و پەراوێزەکان**


[١] تئۆدور آدورنو، تعهد، کتاب زیبایی شناسی و سیاست، ترجمە حسن مرتضوی، تهران، نشر ژرف ، سال١٣٩١، صفحە ٢٧٤ +

Theodor Adorno, Commitment in Aesthetics and Politics, Afterword by Fredric Jameson, Verso edition first published ١٩٨٠, p.١٨٨

[٢]والتر بنیامین، تزهایی دربارە مفهوم تاریخ، کتاب عروسک و کوتولە، ترجمە مراد فرهادپور و امید مهرگان، تهران، نشر گام نو، سال١٣٨٩، صفحە ١٦٠ +

Friedrich Nietzsche “On the Uses and Disadvantages of History for Life” in Untimely Meditations, translated by R. J. Hollingdale, Cambridge University Press, p. ٥٩ + Friedrich Nietzsche,”Vom Nutzen und Nachteil der Historie für das Leben” in Unzeitgemäße Betrachtungen p. ١٢٩

[٣] آلن بدیو، سوژە هنر، کتاب آلن بدیو: فلسفە- سیاست-

هنر- عشق، ویرایش مراد فرهاد پور و...، تهران، نشر رخ داد نو، سال ١٣٨٨، صفحه ٥٢٨ +

'The subject of art', Alain Badiou, The symptom, online journal for www.lacan.com, Transcript by Lydia Kerr

[٤] سەرچاوەی پێشوو، هەمان لاپەرە

[٥] جورجو آگامبن، معاصر چیست؟ کتاب آپاراتوس چیست؟ ترجمه یاسر همتی، تهران، نشر رخ داد نو، چاپ اول ١٣٨٩، صفحه ٥٩ +

Giorgio Agamben, " What Is the Contemporary? "in What Is an Apparatus? translated by David Kishik and Stefan Pedatella, Stanford Univcrsity Press ٢٠٠٩, p. ٤٤

[٦] سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ٦٠ + Ibid, p. ٤٥

[٧] Untimely

[٨] سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ٥٤ + Ibid, p. ٤٠

[٩] تئودور آدورنو، مصالحه تحت اجبار، کتاب زیبایی شناسی و سیاست، ترجمه حسن مرتضوی، تهران، نشر ژرف ١٣٩١، صفحه ٢٣٢ +

Theodor Adorno, Commitment in Aesthetics and Politics, Afterword by Fredric Jameson, Verso edition first published ١٩٨٠, p. ١٦٠

[١٠] سەرچاوەی پێشووی «جورجو آگامبن» ، لاپەرە ٦٠ + Ibid, p. ٤٥

[١١] The reflect theory

[١٢] تری ایگلتون، مارکسیسم و نقد ادبی، ترجمه اکبر معصوم بیگی، تهران، نشر دیگر، ١٣٨٣، صفحه ٧٨ +

Terry Eagleton,Marxism and Literary Criticism, Routledge Classics, London and New York ٢٠٠٢, p. ٤٦

[١٣] Pierre Macherey

[١٤] سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ٧٨+ Ibid, p. ٤٦

[١٥] Epoché

[١٦] noumenon and phenomenon

[١٧] سەرچاوەی پێشووی «جورجو آگامبن» ، لاپەرە ٦١ + Ibid, p. ٤٦

[١٨] expression

[١٩] سه گفتگو: ساموئل بکت و ژرژدوتویی، در کتاب «بکت» نوشته آ.آلوارز، ترجمه مراد فرهادپور- تهران، انتشارات طرح نو، چاپ سوم ١٣٨٨- صفحه ٢٣٤ +

THREE DIALOGUES: SAMUEL BECKETT AND GEORGES DUTHUIT, in Samuel Beckett a collection of critical essays, ed. Martin Esslin, Printce- Hall of India, New Delhi, ١٩٨٠, P. ١٠٣

[٢٠]والتر بنیامین، مؤلف به مثابه‌ی تولیدکننده، ترجمه ایمان گنجی و کیوان مهتدی، تهران زاوش، ١٣٩٢- صفحه ٢٢ +

Walter Benjamin ,"The Author as Producer "in Understanding Brecht, Translated byAnna Bostock, published by Verso ١٩٩٨, P. ٨٧ +

Walter Benjamin,Der Autor als Produzent in http://www.texturen-online.net/methodik/benjamin/autor-als-produzent/

# دەترسێم

**ڕێزان ئاتەشپەنجە**

جا سبەینێ دەچمە نێو هاوڕێکانم‌و بە شانازییەوە باسی ئەوشۆ دەکەم تا بزانن من چەن زیرەک و عاقڵ و بەهێزم. تا ئێستا هیچ کامیان نەیان توانیوە وەک من لە پەنجەرە ڕا خۆیان باوێنە خوارێ، و هیچیان لێ نەیە، هیچیان ئەوەندە پیاو نین. جا چاو لە نێو تاریکیش‌دا دەڕۆم و ناترسێم. بۆیان باس دەکەم تا دڵیان بتۆقێ، جا کە من گێرامەوە ئەو خەپە ناحەزە دەڵێ: وانێ. ناشبێ بڵێم بۆ هاتوومە دەر، خۆ ناکرێ بڵێم خەوم لێنەکەوتووە و هاتووم دایە خەزاڵ چیرۆکم بۆ بڵێ، بۆ کوڕێکێ وەک من عەیبە. ئەودەم پێم دەڵێن: منداڵ، منداڵ، منداڵ. زۆرم شایی بەخۆ بوو کە بڕیارە ئەوشۆ چیرۆکی دایە خەزاڵی ببیسم.

بابە قەوەتم دەیکوت: ساڵان پیرێژنی چیرۆکیان پێ کوتووە، ئێمە کە منداڵ بووین لەبن شۆڕەبی دادەنیشت، تا بابە گەورە لە ڕاوێ دەهاتەوە چیرۆکی بۆ دەکوتین. بابە قەوەتم ئەڵان گەورە بووە، ئێستا دوای ئەو هەموو ساڵە من یەکەم منداڵ بووم چیرۆکی ویم دەبیست. بەڵام نەدەبوو بە کەسی بڵێم دەنا بابە قەوەت گوێی دەکێشام. نازانم بۆ بابە قەوەت قەت نەیدەهێشت بچینە سەر ئەو تەپکەیە، کن دایە خەزاڵی.

بە پێکەنینەوە لە دەرگام دا، دەرگای لێ کردمەوە. ورتە ورتێکی هات نەمدەزانی دەڵێ چی، چاویشی لە من نەبوو، بەڵام دڵنیا بووم بەخێر هاتنی کردم: چابوو هاتی ڕۆڵە گیان خەریک بوو لە سەرمان ڕەق هەڵێم.
کوتم: سڵاو دایە خەزاڵ هاتووم چیرۆکم بۆ بڵێی، خەوم لێ ناکەوێ، نابێ لەکن کەسیش باس بکەی. چاوەڕێ بووم چاوم لێ بکا و وڵامم داتەوە بەڵام چاوی لێنەکردم. چاوی لەسەر دەرگاکە بوو: وەرە ژووریّ قەوەت گیان وەرە. کوتم: دایە خەزاڵ خۆ بابە قەوەت لێرە نیّ، نەچی لەکنی باس کەی!

سیلەیەکی لە ژوورەکە کرد، بزەیەکی هاتێ و دەرگاکەی پێوە دا.

کوتم: چیرۆکم بۆ بڵێ. لێی ڕوانیم پاشان ڕووی لێ وەرگێرام: قەوەت گیان ئەوشۆ زۆر ساردە و زریانە، مۆمەکانم زوو زوو



لێ دەکووژێتەوە، ئەو پەنجەرەیە درزی هەیە.
کوتم: دایە خەزاڵ خۆ کەسی لێ نیّ؟!
دەتکوت لە گوێی گادا نوستووە، گوێی لە دەنگم نەدەبوو.
ـ ئایی زوو سۆبەکەم بۆ داگیرسێنە ڕۆڵە زوو، چی؟ ئەتهەوێ بڵێی چی؟ خۆت ئەزانی من بێ مۆمەکانم ناتوانم، چۆن ڕۆڵە گیان دەڵێی با هەروا دامرکاو بن و وڵات تاریک بێ؟ لە جێی خۆی وەستا، وڵات بێ هەست و خوست بوو. سووڕاوە و چاوێکی لە من کرد.

ـ جا ڕۆڵە گیان ئەگەر هات و کەمیمان هێنا تۆ بڕۆ شار و بۆم بێنە.
کوتم: دایە خەزاڵ گیان خۆ کەسی لێ نیّ، نەکا بابە قەوەتت شاردبێتەوە؟ بزانێ من لێرەم گوێم دەکێشێ.
ـ ئەخە قەوەت گیان بڕوا بکە تاریکی خۆش نیّ، دزێوە.
دیسان کوتم: دایە خەزاڵ خۆ کەسی لێ نیّ. گوێی نەدامێ.

ـ نەخێر من ناترسێم، تەنیا شەو و تاریکیم پێ جوان نیّ، ڕەشم بە دڵ نیّ تەنانەت بۆ جلی بەریشم کەڵکی لێ وەرناگرم. بە وردە هەنگاوان لێی نزیک بوومەوە، دەستم بە داوێنی گرت: دایە خەزاڵ دایە خەزاڵ، زوو چیرۆکم بۆ بڵێ زوو. چاوم لە خەو ڕاچوون و گرنم لێ گرت: چیرۆکم دەوێ چیرۆک چیرۆک، بەڵام دیسان گوێی لە من نەبوو بۆ لای مۆمەکانی چووم، چاوێکم لە دایە خەزاڵ کرد و لە حەیفان تەواویانم فوو لێ کرد.

هەر شەمێکی دەکوژاوە، دایە خەزاڵ چکۆڵەتر دەبۆوە، چرچ دەبوو و خۆی دەخزاندە بن پەتۆکە. بە سەبری دەیکوت: دەی قەـ وەت مۆـ مۆـ مۆمەکانم بۆ داـ دا گیرسێنە. بینیم لە نێو دەستی قوتوو شەمچەکەی توند گرتووە، چووم بۆ لای و لە حەیفان دەستیم توند گرت تا لێی بستێنم. هێزی زۆر بوو، هەر ئەو دەیکێشا و چاوەکانی زەق دەکردن و منیش بۆ لای خۆمم دەکێشا و بەردەوام دەمکوت: چیرۆک چیرۆک چیرۆکم بۆ بڵێ. ئاخری توانیم قوتوو شەمچەکەی لە دەستی بستێنم. هەر کە لێم ستاند توند زیقاندی. تووووووند هەستا سەر پێ و بە دەوری خۆی دا دەسووڕاوەو دەیزیقاند. مات بووم و لێی کشامەوە.

لە دەلاقەی ژوورەکەوە لە دەرێم ڕوانی؛ هەموو ماڵەکان ڕووناک بوون.

دایە خەزاڵ بەردەوام دەیزیقاند و بچوک دەبۆوە.
پشتم بە دەرگاکەوە نا، هانکە هانکم دەهاتێ و لەگەڵ خۆم دەمکوت: بابە قەوەتم ئێستا گوێم دەکێشێ.





# نوسین و زمانی ژنانە لە دونیایەکی پیاوانەدا

**هۆزان محمود**

زمان و نوسینی ئەدەبی، گێڕانەوە و نوسینەوەی مێژوو کۆمەڵێک بوارن کە تائەم ساتەش ڕەخنەی زۆری لەسەرە. لێکۆڵەرە فێمینیستەکان ڕەخنەی گەورەیان لەسەر نوسینەوەی مێژوو هەیە چونکە لەلایەن پیاوانەوە نوسراوە و تەنها سەروەری و دەستکەوت و شەڕو داهێنانەکانی پیاوی تیا نوسراوەتەوە. لە کتێبە مێژووییەکاندا ژنان پەراوێزخراون و هەڵدراونەتە دەرەوەی مێژوو. لێکۆڵەرومێژوونوسە فێمینیستەکان بەشێکی زۆر لە لێکۆڵینەوەکانیان تەرخان کرد بۆ ڕەخنەگرتن لەو مێژووە و مێژوونوسانی پیاو.
نوسینەوەی مێژوو لە ڕوانگەیەکی فێمینیستی و دەرخستنی ڕۆڵ و بوون و داهێنان و دەستکەوتەکانی ژنان بووە بوارێکی گرنگی ڕەخنەی فێمینیستی سەدەی ڕابوردوو. نوسینەوەی ئەم مێژووە و دەرخستنی دەور و نەخشی ژنان کار ئاسانی کرد بۆ لێکۆڵینەوەی ئەدەبی ژنان. لە ڕێگەی دۆزینەوەی سەرەتای نوسین و بەرهەمی ئەدەبی ژنان، توانرا تێگەیشتنێک دروست بکرێ لەسەر ژیان و ڕۆڵ و پێگەی ژن لەو سەردەمەی تیایدا بوون. بیرکردنەوەی پیاوانە/ماسکولین، کولتوری نێرسالاری و بالادەستی پیاو لە زەمەنە یەک لەدوا یەکەکان نارەزایەتی و بەرەنگاری فێمینیستی بەرهەم هێناوە. فێمینیستەکان بەتایبەت شەپۆلی دووهەم لە ئەوروپا و ئەمریکا گرنگییەکی زۆریان داوە بە شیکاری و هەڵوەشانەوەی ئەم تێگەیشتنە دوگم و زاڵەی پیاوانی نوسەر و هونەرمەند.

دیارە بوارێکی تری گرنگی مەیدانی فێمینیزم سیاسەت و دیاریکردنی ستراتیژو پلانی جیاواز بۆ بەدەستهێنانی ماف و ئازادی و یەکسانی لە کۆمەڵگەدا بووە. لەپاڵ ئەمەشدا پرسیار دروستکردن و چوونە ناو زۆربەی ئەو بوارانەی کە پێشتر تەنها بۆ پیاوان بوون بەشێکی تری خەباتی ژنانە. تیۆریزەکردن و بەرهەم هێنانی تێگەیشتنی تایبەت بە پرسی ژن، جێندەر وسێکسوالیتی لە هەموو بوارەکاندا بەتایبەت لە حەفتاکانی سەدەی ڕابردووەوە دەستی پیکرد. گرنگە لە بیری نەکەین کە هەندێک لە پیاوانی نوسەر و ڕوناکبیر وە سیاسی زۆرجار بەشداربون لە بەرەنگاربونەوەی ئەم دۆگما کۆمەڵایەتییانە. بۆ نمونە جۆن ستیوارت میل لە نوسینی (چەوساندنەوەی ژنان-The Subjection of Women ١٨٦٩) وەکو بەشداری یەکی گرنگ هەژمار دەکرێ لە نوسینی فێمینیستی.
هەروەها کتێبی (ڕەچەڵەکی خێزان-The Origins of the Family ١٨٨٤) کە لەلایەن فرێدریک ئەنگلسەوە نوسراوە،



Berthe Morisot: Young Girl writing (١٨٩١)

بە بنەمایەکی گرنگ دادەنرێ بۆ شیکاری و هەروەها تێگەیشتن لەرزگاربوون لە پەیوەندییە کۆمەڵایتی و خێزانییەکان، کەلەسەر بنەمای بەرژەوەندی کۆمەڵگەی سەرمایەداری دامەزراون. لێرەوە فێمینیستەکان کۆمەڵگە و شارستانیەتی خۆرئاوایان بە باوک سالار، چەوسێنەر، وە نێرسێنتەر لەقەڵەم داوە. لەو باوەڕەدا بوون، مادامەکی شارستانیەتی (خۆرئاوا نێرسێنتەر/فالۆس سێنتریک)ـە کەواتە خاوەنی زمانێکی پیاوانەیە و پیاوگەرایانەیە.

قوتابخانەی فێمینیزمی فەرەنسی لە حەفتاکانی سەدەی بیستدا کەوتنە ڕەخنەگرتن لە (زمان) وەک میدیۆمێک بۆ بەرهەم هێنان و چەسپاندنی نۆرم و بەها کۆنەپارێزەکان و جیاکارییە جێندەرییەکان. خانمە ناودارەکانی قوتابخانەی فەرەنسی ( هێلین سیکسو، لوس ئیریگاری، جولیا کریستیڤا، مۆنیک ویتیگ و ئەوانیتر) لە حەفتاکانی سەدەی رابردوو کەوتنە ڕەخنەگرتن لە زمان. وە ئەمانە دژی بیری ماسکولینیست بوون. کۆک بوون لەسەر شیکاری کولتوری خۆرئاوا وەک چەوسێنەر و فالۆس سێنتریک/ نێرگەرا. شارستانیەتی خۆرئاوا لەسەر دەستی پیاوی سپی دروست بووە، زۆرجار فێمینیستەکان دەڵێن ڕەنەیسانس بۆ ژنان نەبووە، ڕۆشنگەری و فەلسەفەی خۆرئاوا لە سەرەتادا ژنی خستۆتە دەرەوەی خۆی، تەنانەت مۆدێرنەش

ژنان کێشەیان هەیە لەناویدا.

فێمینیستەکان لەوباوەڕەدا بوون کە پیاوی سپی خۆی بە نێوەندی جیهان دادەنێت، (سپی، ئەورووپی چینی دەسەڵاتدار. وە دونیای دەرەوەی خۆی بە "ئەویتر- The other" ناوزەد دەکات و کاتێک مانا پەیدا دەکات کە پەیوەندی بە پیاوی سپی یەوە هەبێت وەکو پیاو/باوک، وە خاوەنی فالۆس). ئەم خۆ بە سێنتەر زانینە لە ڕێگای دین و زمان و فەلسەفەوە ڕاگیراوە. ئەم خۆ بە مەزن زانینەی پیاوی سپی نەک تەنها لەسەر ژێردەستەیی ژنی سپی بەرهەم هاتووە، بەڵکو ئەم خۆ بە مەزن زانینە لە ئاست ئەویتر کە (سپی) نییە خۆی پێناسە دەکاتەوە.

قسە کردن، نوسین، بەکارهێنانی زمان لەم ڕوانگە خۆ بە مەزن زانینەوە دەستبەسەرداگرتنی دونیایە بە شێوەیەکی سیمبۆلیک وە لە ڕێگەی هێزی شەفەوی یان زارەکیەوە (verbal mastery). پیاوی سپی باڵادەست کە ئیمتیازی سپی بوون و پیاو بوونی هەیە بەردەوام ژنی خستۆتە دەرەوەی مێژوو، فەلسەفە و سیاسەت و ئەدەبەوە. گوتاری سیمبۆلیک یان دیسکۆرسی سومبولیک (Symbolic discourse) لە کۆنتێکستی جیاوازدا ئامرازێکی ترە بۆ بەکاڵاکردن و بە شمەک کردنی دونیا، قسەکردنە بە نوێنەرایەتی هەموان بەژنانیشەوە.
ژنانی قوتابخانەی فێمینیسمی فەرەنسی بەتایبەت خاتوو هێلێن سیکسو زمان دەخاتە ژێر ڕەخنەو بانگەواز دەکات بۆ نوسینێک کە ژنانە بێت. بەو مانایەی زمان و نوسینەکان ببێتە جێگای دەربرین و باس لە خودی ژن بکات، باس لە جەستە و حەزە سێکسوالیەکانی ژن بکات.
(هێلێن سیکسو-Hélène Cixous) خانمە فەیلەسوفی فەرەنسی ساڵی ١٩٧٥ لە ئێسا گرنگەکەیدا لە ژێر ناوی پێکەنینی مێدۆسا- The Laugh of the Medusa دەڵێت:
" ژن دەبێت خۆی بنوسێتەوە: لەبارەی ژنەوە بنوسێت و ژن بهێنێتە نوسین کە بەشێوەیەکی توندوتیژ دوورخراونەتەوە لێی، هەروەک چۆن لە جەستەی خۆیان دوورخراونەتەوە".

تا ئەو ساتە وەختەش کە ئەم خانمانە و بەر لەمانیش ڕۆمانوسی گەورەی بەریتانی ڤێرجینیا وۆلف باسی لە گرنگی نوسینی ژنانە کردبوو. بەهۆی ئەو بەربەستانەی کە زمانی ئینگلیزی بۆی دروستکردبوو لە کاتی نوسینی ڕۆمانەکانیدا. پیاوانی نوسەر زۆر بە ئاسانی زمان بەکار دێن بۆ باسکردن و گێڕانەوەی چیرۆکی سێکسوالی پاڵەوانەکانی و سێکس کردن لەگەڵ ژنان. لەکاتێکدا ژنە ڕۆمان نوسەکان زۆر بەربەستیان هەبووە لە بەیانکردنی هەست و حەز و ئارەزوە سێکسوالییەکانی ژنە پرۆتاگۆنیستەکان لە ڕۆمان و شیعر و نوسینەکانیاندا.



Luce Irigaray -French born ٣ May ١٩٣٠

(لوس ئیریگاری -Luce Irigaray) خانمە فەیلەسوف و فێمینیستی بەلجیکی سەر بە قوتابخانەی فێمینیزمی فەرەنسی لەو باوەڕەدایە؛ کە حەزی سێکسوالی ژنان (Jouissance) ناکرێ لە ڕێگەی زمانێکی باڵادەستی، بەفەرمانکراو وە پیاوانە دەربڕدرێ. هەروەها باوەری وەهایە کە ژنان زۆربەی بەشەکانی لەشیان ئۆرگانی سێکسیە، ژنان جەستەیان شوێنی زیاتری هەیە بۆ چێژ وەرگرتن لە سێکس، هەربۆیەش زمانێکی ژنانە باشتر دەتوانێت دەربڕینی هەست و سۆزی ژن وێنا بکات، نەک زمانێکی پیاوگەرای فالۆس سێنتریک.

بێگومان هەر تیۆرێکی بوێرانە بێ‌ڕەخنە نییە، هەردووخانمە فێمینیستی سەر بە قوتابخانەی فەرەنسی سیکسو و ئێریگاری ڕەخنەیان لێگیراوە بەوەی کە گشتگیربوون و داهێنانی زمانێکی ژنانە و جیاکردنەوەی لە پیاو کارێکی هەڵە بێت. ئەم دوو خانمە هاوڕان لەسەر ئەوەی کە ژنان بە درێژایی مێژوو کورت کراونەتەوە بۆ (بونەوەری سێکسی) و ئۆبجێکتێکی چێژ بۆ پیاو. لە شێوەی (سۆزانی یان پاکیزە، هاوسەر یان دایک) وە ڕێگەیان لێگیراوە لەوەی هەست و سۆز و حەزی سێکسوالی خۆیان وەک خودێک/ ئیندیڤیدوالێک لە ڕێگەی زمان و نوسینەوە دەربڕن. هەموو ئەو لێکۆڵینەوە و ڕەخنانە لەسەر وێنای ژن ونبوونی دەنگی ژنان لە ئەدەب و زماندا خزمەتێکی زۆری کردووە بە گۆڕینی بنەڕەتی لە دونیابینی نوسەرانی ئەم سەردەمەی ئێستادا.

**سپاس بۆ لاپەڕەی کولتور مەگەزین،**
**کە ئیزنی بڵاوکردنەوەی ئەم بابەتەی بە ئێمە بەخشی.**

## زمانی سکۆلار: دیالکتیک دژی دیالکتیک

عەبدولقادر نیازی

(سووکە ئاورێک لە سەر یۆتۆپیزم کردنی زمانی شێعری کوردی)

خۆپاراستن لە زمان وەک پێکهاتەیەک، کە خاوەنی پێشینە و قورسایی تایبەت بەخۆیەتی و هەمیشە خۆی لە قەبارەی گەلێک نیشانەی کەلتووری و ئەدەبی و سیاسی کرژ و پڕ حەجم دا بەرجەستە کردووە، دەکرێ وەک هەڵوێست و تەنانەت دژکردەوە و لە خراپترین حاڵەتی خۆی دا، وەک جۆرێک ئینفعال و بەرهۆکاری لێی بڕواندرێ.

پێشینە و کرژایی و هەروەها بارستایی و هەڵکێش داکێشی زمان (نوسان)، کە لە بنەڕەتەوە سەرچاوە لە زەین دەگرێ و بە دیالۆگی ڕۆژانە و ئەدەب و سیاسەت و تەنانەت شانۆ و سینەماش کۆتایی دێ، گرینگایەتی ئەو سەرێتیەی مرۆڤ دردەخا کە زمان گرینگایەتی خۆی هەیە و خانەی وجوودیشە.

ئەوەیکە لەو مابەینەدا بە چ ڕوویکەرد و میتۆد گەلێکەوە لە زمان بڕواندرێ و چ ئاکام و دەرئەنجامێکی لێ بکەوێتەوە و شرۆڤەی زمان و بەسووژە کردنی بە چ ئاقارێک دا بەرێ و.... هەم بابەت گەلێکی گرینگ و جیاوازن هەم دەکرێ وەک بنەما و پرەنسیپی لێکۆڵینەوە لە مەڕ زمان بێنە ئاراوە.

ئەدەبی کوردی بە گشتی و شیعر بەتایبەتی، لە دەسپێکی خۆیەوە تا ئێستاشی لە گەڵ بێ، حەولی ئەوەی داوە کە دانستە یا نادانستە خۆی لە دووتۆی شێوەیەک لە دیامیزم و ئسنۆبیزمی زمانی دا، بدۆزێتەوە.

سەرەڕای ئەوەش، خوێندنەوە و قەرائەت گەلێکی کە لەو کردە زمانییە (کنش زبانی)، کە وەک دیاردەیەک خۆی لە شێعری کوردی دا نیشان داوە، کراون، خۆی هەڵگری گەلێک پرسیارە، کە لە زۆر جێگادا بە هۆی نەبوونی ڕەخنەگری جدی و بێ لایەن، بێ وڵام ماوەتەوە.

ئەوەیکە باس لە زمانی کوردی و ئەکتیویتە و ڕەهەندەکانی لە شێعری کوردی دا دەکرێ، ڕەنگە چەمک و تەوەرێکی زۆر کوللی و گشتی بێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەش ناکرێ پێوەندی هەر کام لەو کردە زمانییانە نەخرێتە بەر شرۆڤە و لێکۆڵینەوە. ئەوەی دیارە ئەوەیە کە دیاردە ناسی زمانی کوردی لە شێعر دا، بە هۆی هەندێ خوێندنەوەی خێڵەکی و دەمارگرژانە و دارماوەوە هێشتا بەو جۆرەی شیاوە نەچۆتە خانی بە پرۆبلۆماتیک بوونێکی تیئۆریک و زانستی شیاوی خۆی. ئەو خەسارانەش نە تەنیا سەربەخۆیی زمان وەک فاکتێکی خوڵقێنەر کە زمانی کوردیشیان تا ڕادەیەکی زۆر خستۆتە پەروازێز و ئینزوا و گۆشەگیرییەوە.

دیارە لەو بەستێنەش دا، کەباس لە سەربەخۆیی زمانی شێعری دەکرێ، نە بەمانای پاکتاو کردن یا سڕینەوە یا نکۆڵی کردن لە دیکەی کردە زمانییەکان، کە ڕێک ئاماژە بەو ئیگزیستە سەربەخۆیە دەکا کە زمان لە شوێن کاتێکی دیاری کراو و خاوەن موختەساتی تایبەت بەخۆی دا مانیفێستی بۆ دەردەخا و لەو دۆخەدا خۆی لە بەکارهێنەرانی جیا دەکاتەوە و دەبێتە دیسکۆرسێک کە تەنانەت خۆی لە ژێر کۆگای بەرهەڵستی بە ڕواڵەت ئەخلاقیش دا دەدزێتەوە. جیا لەوەیکە ئەو کردە زمانییە و زۆرجار بێ ئەخلاق و سکۆلارە، تاچەند دەرەتانی دیالکتیک لە گەڵ فەزای






زاڵی ئەدەبی کوردی و بارگراوەندی ئەخلاقی و کلتووری و تەنانەت ئوستوورەیی کۆمەڵگای کورد دا پێک دێنێ، زۆرجار مەکۆی موناقشە بووە. لەبەر ئەوەیکە ئەو کردە زمانییە سکۆلار وغەیر ئەخلاقییە (نەک دژە ئەخلاق)، بەردەوام دیالۆگ و تەعامولی لە گەڵ هزر و ئەندێشە هەبووە و خوێنەریش لەکۆمەڵگای کوردی دا زۆر بە دەگمەن خۆی لە قەرەی زمانێکی بنەماشکێن و لە خۆشخیم ترین حاڵەتی خۆی دا(سکۆلار)، نزیک کردۆتەوە. بێ گومان ئەو دووبەرەکییە سەرچاوەی لەو تاک لایەنی و ئوستوورە پەرەستییە گرتووە کە نە تەنیا لە ستروکتۆر و فۆرم دا، کە ڕەگاژۆی دە تەئویل و بەستەرێکی هێرمنۆتیکی تەواو ئەخلاقی و خێڵەکی دا کردووە کە بە هیچ شێوەیەک لە شێوەکان نە تەیاری وەرگرتنی زمانی سکۆلارە نە حازرە تەعامولیشی لە گەڵ بکا.

ئەگەر چی بەهیچ شێوازێک ناکرێ ڕوویکەرد و فەرایەندە

زمانییەکان، دە چوار چێوەی پێناسە و ناساندنێکی هەمەلایەنە و چڕ دا شرۆڤە بکرێن. بەڵام ئەوەی ڕاستی بێ ئەوەیە کە لە حاست زمانی سکۆلاری شێعری کوردی دا، ئێپیستمۆلۆژی زمانی کوردی بە هەموو جێگە و پێگەی خۆیەوە پێویستی بە خوێندنەوەیەکی سەردەمیانەتر و یۆنیڤێرسالتر هەیە بۆ ئەوەی خۆ لە هەندێ ئوستوورە پەرەستی و ئەو دوگماتیزمە واتایی و ناوەرۆکییە دوورە پەرێز کاتەوە، کە زۆر جار دژبەری ڕاسیۆنالیزم و عەقڵانییەت باوەڕییە.

زەروورەتی وەها ڕووبەڕوو بوونەوەیەک لە گەڵ زمان و شێعری کوردی، ڕێک سەرچاوە لەو دیالکتیکە زیندوو و ئەو دینامیزم و کاتالیزۆرە عەقڵانییە دەگرێ کە لە پێوەندی و تەعامولی زمان و تاک دا خۆی دەردخا.

ئەوەی کە دیارە ئەوەیە، زمان بە هۆی ڕۆچوونی دە باروودۆخ گەلی جیاواز دا هەمیشە خاوەن هەڵوێستێکی ڕەخنەگرانەیە و تاکیش بە هۆی چەمەوازبوونی لە مابەینی ئەندێشە و زمان دا بەردەوام پێویستی بە شوناسێکی عەقڵانی تر هەیە. پێوەندی نێوان ئەو دوو تەوەرە پتر لە وەی کە پێوەندییەکی ڕۆژانە و ژورنالیستی و داڕووشاو بێ، ڕوویکەردێکی تەواو فەلسەفی و ڕەوان ناسانەیە کە بەر لەوەی زمان و ئەندێشە بەرەو ناشوێن ڕاگوێز کا، سووژە وەک «من»ـێکی ئافرێنەر و خاوەن هەڵوێستێکی ئیجابی و پۆزەتیڤ دێنێتە کایەوە. بۆ ئەو مەبەستە پتر لە گشت مێتۆدەکانی خوێندنەوە، هەست بە لێک دابڕینی زمان و ئەو بەستەرە کۆمەڵایەتییە دەکرێ کە هێشتاش پەلەقاژەی ئوستوورە پەرەستی و چەنگەپرچەی دوگماتیزمیەتی.

دیارە بۆ ئەوەش پاساوی تایبەت هەیە و پێشتریش ئاماژەی پێ درا کە سازکردن و لانیکەم هەموار کردنی فەزایەکی کراوە بۆ مسۆگەر کردنی دیسکۆرسێکی تێئۆریک پێویستی بە کردە و ئەمری زمانی هەیە کە بتوانێ هاوکات پێوەندی نێوان زمان و خوێنەر و دەق مسۆگەر کا. ئەوەش بێ شک






دەگەڕێتەوە سەر توانایی و خسڵەتی زمان بە گوێرەی ئەو توخم و ماکانەی کە لە تەعامول لەگەڵ دنیای زەین و دەرەوەی زەین دا وەک ئۆبژە دەیانبینێ.

ڕوانینێکی ئاسایی لە سەر زمان و ڕەنگ دانەوەکانی لە سەر شێعری مۆدێرنی کوردی کە خۆی لە تیترێکی پڕناوەرۆکی وەک شێعری مێترۆپۆل دا دۆزیوەتەوە، سەلمێنەری ئەو ئیدعایەیە کە زمان لە شێعری شاردا بە پێچەوانەی هەندێ جەریانی شیعری، نە دە خزمەت پەیام و بۆنەیەکی تایبەت و تاکێکی تایبەت دابووە، کە پتر سەرهەڵداوی ئەو تەعامول و دیالکتیکە بووە کە زمانی کوردی لە گەڵ عەقڵانییەتی یۆنیڤێرساڵ و هەروەها مێژووی ئەدەبی جیهانی و ئەندێشەدا هەیبووە. باس لە شێعری مێترۆپۆل(کلان شهر) کە دەکرێ، مەبەست لە دۆخە زەمانی و مەکانییە کە مێترۆپۆل دە پێناسەی فیزیکی خۆی دا هەرگیز نەیویست و نەشیتوانی خۆی لێ دەرباز کا.

دیارە ئەوەش دەگەڕێتەوە سەر ئەو پرەنسیپە کەلتووری و سیاسی و تەنانەت ئابوورییانە کە پتر لەوەی تەنیا بەرساخت یا واسازی و نۆژەن کردنەوەی تیۆری سیاسی و کەلتووری بێ، سەرچاوەی لە زمانێکی کاربوردی و کۆمەڵناسانە گرتووە کە خۆی بەشێکە لە توانایی زمان.

بە گوێرەی ئەوەی تا ئێرە کوترا، دەکرێ بکوترێ کە کۆمەڵگای کوردی لەگەڵ ئەوەیکە هێشتا بەو جۆرەی شیاوە نەیتوانیوە خۆی لە گەڵ چەمکی شار و مێترۆپۆل دا ڕێک بخا تا ڕادەیەکی زۆریش لە مابەینی چەمکی سوننەت و مۆدێرنیزم دا تووشی هەڵپەسێراوی و دۆخێکی ئانۆمیک و لە گەش بینانەترین حاڵەت دا تووشی خوێندنەوەیەکی سەقەت و لانیکەم دەڵەمە بووە، لە کاتێک دا کە شێعری کوردی بە هۆی تەعامولی زمانی، خۆی لە قەرەی شێعری پۆست مۆدێرنیش داوە (شێعری بەرەی چوار)، هێشتاش خوێندنەوەی دەقی نوێ و تێئۆریک ئەو جۆرەی کەشیاوە ڕەگاژۆی دە ڕەخنەی ئەدەبی دا نەکردووە.

بۆ دەرچوونی کۆمەڵگا لەو دۆخە پتر لە گشت کەرەستەکان، هەست بە زەروری بوونی چەند فاکتەری گرینگ و سەرەکی دەکرێ کە گرینگترینی ئەوان ئەوەیە زمان نەک وەک ئامراز کە وەک ئامانج (هدف) سەیری بکرێ (فێردینان دۆسووسوور).

دوورەپەرێزی لە خوێندنەوەی دوگم و تاک لایەن و دەمارگرژانە لە ناسیۆنالیزم و خۆپاراستن لە ئوستوورە پەرەستی و سووژە کوشتن فاکتەرێکی ترە کە دەبێ بەشێوەیەکی جدی لێی بڕواندرێ.

# کوڵەپارچای «دەروەدەر»

نۆسەر: لەنگستون هیووز، هەڵگەردانەر: عەلی عەلیزادە

وەفـر وە وەر چـەوێ ناتیـاد. ئێـوارەی یەکـێ لـە ڕووژەیـل دەوران کەسـادی، هەنـای سـارجنت لـە قەتـار بـاری داوەزیـا، وەپسـا ئـڕا تاوێگیـش ئـاگادار وەفـر نـەۆ. هەرچـەن وەدڵقورسـییەو ڕەخنـەی سـەرما و نـم، لـە نـاو قـەو و پووتینەیلـێ هەسـت کردیـا. ئەمـما ئەگـەر لـە لـێ بپرسـیاید، نیەزانسـتیا وەفـر وارێ. سـارجنت وەپسـا لـە ژێـر چراخەیـل پڕنۆریـش، ئـێ وەفـرە نیەۆنیـا؛ وەفـرێ ک نـەرم و چەرمـێ لـە دڵ شـەو داڕشـیاد. فـرە شـەکەت بـۆ، چـەوێ وە خـەو بـۆ، فـرە ورسـێ بـۆ.

ئەمـما ڕێـزدار کەشـیش دورسـت هـەر یـە ک چـراخ ئەیـوان داگیرسـان و دەر کەشیشـخانە کـردەوە، وەفـر و پیـای سـییەپووس چوارشـانەیگ دی؛ وە شـێوەیگ وەفریـن (جـۆ لەتێـگ لـە شـەو ک شـێوەی ئایـەم گـردۆ و وەفـر لەبـان شـێوەی نیشـتۆ). ئـەو چەتـاڵ دیـار بـۆ. هێـمان دەمـێ واز نەکـردۆ ک ڕێـزدار دورسـت کەشـیش وەت:

- بووەخشـین. نـە! هـەر ئـێ خێیاوانـە ڕاسـا بچـووە نـوا و دۆای چـوار کۆچـە بپیچنـە دەس چـەپ. هەفـت کۆچـە نواتـر پەنـاگای مێیەتـدان دۆنیـدەو. وەداخەو، نـە!

دەرە بەسا.

سـارجنت تواسـیا وە پیـای ڕەوهانـی بۆشـێ ک پێشـتر وە ئـەو پەنـاگا سـەر داس و لـە ئـەو دەوران کەسـادییە وە سـەدها پەنـاگای مێیەتـدان تریـش چێیـە؛ ئەمـما ئـەورە هەمیشـە فـرە شـلخ بـۆ و تەخـت چـووڵ پەیـا نیەواتیـا و شـامیش تەمام بـۆ. جیـا لـە گشـت یانـە، ڕەنـگ پووسـیش ڕەچـاو کردیـان. ئەمـما کەشیش وەت «نـە» و دەر بەسـا. دیـار بـۆ ک تاقـەت ئـێ قسـەیلە نەیاشـت. خـوو، دەرێگیـش داشـت ک بووەسـێ.

سـییەی قـەۆ هاتـەو. وەپسـا ئیسـە ک یەکـڕاس لەنـاو دڵ وەفـر ڕێ کردیـا، هێـمان وەفـر وە چـەو نیەۆنیـا. هەرچـەن هەتمـەن هەسـت کردیـا ک چشـت سـەرد و تەڕێـگ وە چەنـەی لکێـد، کلگەیـل سـییەی تـەڕ کەیـد و داڕشـیەیدە نـاو پووتینەیلـێ. وە سـەرما قـووخ دا و لـە پیادەڕێ وسـا. ورسـێ و شـەکەت نووڕسـە هـەر دو لەیـن خێیاوانـەو. چـەوێ کەفتـە وەرانـوەرێ؛ وەرانـوەرێ کلیسـایگ بـۆ. ئەڵبـەت، کلیسـا! نزیـک نشـینگەی کەشـیش بایەدیـش کلیسـایگ بـوو.

کلیسـا دو دەر داشـت. پلەیـل پیـەن و چەرمێـی، لـە شـەو پووشریـای لـە وەفـر بـۆ. دو تـاق بـەرز زەربـی وەگـەرد سـتوونەیلێگ کوچگیـن و لـەڕ، لـە هـەر دو لەینیـان. بانـتر، لەناوەیـن دەروەچێـگ خڕ و تـووڕی، مەسـیهـ لـە بـان خـاچ ێـگ کوچگیـن بزمارکـوت بـۆ. گشـت یانـە لـە ژێـر وەفـر و چراخەیـل خێیـاوان واقیـان پـەڕۆ. ڕچیـای و واقپەڕیـای و کوچگیـن.

سـارجنت چـەو پـرکان. هەنـای نووڕسـە بـان سـەرێ، وەفـر پـڕۆش پـڕۆش ڕشـیادە نـاو چـەوێ. ئیسـە ئـاگادار وەفـر بـۆ. سـەرێ جـمان و وەفـر دەربـاڵ کوتێ تـەکان. هەسـت کـرد ورسـێیە، هەسـت کـرد گـوم بـۆە، هەسـت کـرد گـوم نـەۆوە، هەسـت وە سـەرما کـرد. لـە پلەیـل کلیسـا چێیـەو بـان. دەر کوتـا. جـواوێ نـات. دەسـگیرەی دەر چەرخـان. چفـت بـۆ. شـانێ نـادە بـان دەر و بـاڵای بـەرز و سـییەی جـۆ دەیلـەم لارەو بـۆ. خوشـار دەر دا. وە ناڵەیلێـگ بـەرز و ئاهەنگیـن جـۆ خەمناڵەیـل سروودەیـل کووڵـی یەیـل، وە گشـت هازێیـەو لاشـان دیـادە دەر.

- شـەکەتم... ئـاخ! ورسـێمە... ئـاخ! خـەوم تـێ... ئـاخ! سـەردمە... ئـاخ! بایـە لـە جییـگ بخەفـم. ئاخـە مـەر ئێـرە کلیسـا نییـە؟ سـە ئـڕا... ئـاخ!

لەنـاکاو وە لاشـاندانەیل وەهشـیانەی سـییەپووس، جیڕەجیـڕ تەختەچووەیـل هەڵسـا. ئیسـە سـارجنت وە شـێوەی نادیارێـگ شـنەفتیا ک چـەن کـەس چەرمێپـووس لـە مـل سـەرێ هـاوار کـەن. س چـوار کـەس تریـش دەوان دەوان خوەیـان ڕەسـانن و لـە بـان سـەرێ هـاوار کـردن:

- هەی یاروو... هەی!

سییەی بەرز و چوارشانە وەت:

- ئاخ! زانم ک ئێرە کلیسای چەرمێیەیلە، ئەمما منیش بایە لە جییگ بخەفم.

لاشان ترێگ دادە دەر:

- ئااااخ!

ئێ جار دی دەر بنکول ڕمیا.

ئەمـما هێـمان دەر وە ڕۆی نەکریـاۆ، دو ئەفسـەر پولیـس چەرمێپـووس وە ماشـینێ خوەیـان ڕەسـانن. باتـوم وە دەس لـە پلەیـل دەوینـە بـان و سـارجنت وە پشـت گـردن. ئەمـما ئـێ کـەڕەت ئـەو وە هـۆچ قەیمەتـێ نیەتواسـیا لـە نـوای ئـێ دەرە دەر بکریەیـد.

سـارجنت چەنـگ خـس، نـە وەرەو چشـت ناپایارێـگ جـۆ دەرێـگ شـکیای، بەڵکـم وەرەو یەکـێ لـە سـتوونەیل بـەرز و لـەڕ لای دەر. گـردێ و قایـم گیـرێ دا. پاسـبانەیل وە ئـەو، و ئـەو وە سـتوون چەوسـیاۆ. چـەن کەسـیش لـە نـاو خێیـاوان هاتنـە مێیـەت پولیـس تـا سـییەپووس لـە ئـەورە دەر بکـەن.

مەردم وەگەرد خوەیان وەتیان:

- سییەی نەکەرەی بێکار، چەوسیاسە کلیسای ئیمە! چ ڕۆیگ دێرێ.

پولیسـەیل وە باتـوم وە سـەر و کـووڵ سـارجنت کوتیـان و هۆچکەیـش ناتیـادە جـواو. ئەمـما ئـەو دەس نیەکیشـیادەو. ئمجـا کلیسـا داخروومیـا .

سـەردەر گـەورا و کوچگیـن کلیسـا، دیوارەیـل و دیرەکەیـل، خـاچ و مەسـیهـ یەکـێ دۆای ئـەو یەکـێ خاپـۆر بـۆن. دۆاخـڕ، گشـت سـاختمان داخرووميـاد و خشـت و ئاجـوڕ لـە بـان سـەر پولیـس و مـەردم خاپـۆر بـۆ. گشـت کلیسـا لـە ژێـر وەفـر داخرووميـا.

سـارجنت خـوەی لـە کلیسـا کیشـادە دەیشـت و لـە ئنـاز خێیـاوان کەفتـەو ڕێ. سـەلیب کوچگیـن لـە بـان کووڵـێ بـۆ. لـە یـە ک مـاڵ لـە بـان سـەر کەشـیش دورسـت، ک وەپـێ جـواو سـەربان داۆ، خاپـۆر کردێیـە خەنـی و سـتوونەگە لـە شـەش کۆچـە ئەولاتـر خسـتەو زەۆ و درێـژە وە ڕێـی دا. گەمـان کردیـا تەنیـاس، ئەمـما وە کرچـە کـرچ گامەیلـێ ک گـووش دا، دەنـگ گامەیـل یەکـێ تریـش شـنەفت ک هـاوگام وەگـەردێ هاتیـاد. هەڵەوگـەردی و دی ک مەسـیهـ پا وە پـای تـێ. چـمان وە ڕمیـان کلیسـا لـە خاچەگـەی کەنریـاۆ.

سارجنت وەت:

- یاخودا! یەکم جارە دۆنم لە بان خاچ نید.

مەسیهـ ک ئیسەیش ئاهەنگ گامەیلێ لەناو وەفرا وە گووش هاتیاد، وەت:

- ئەرێ، بایە کلیسا خراو بکردیاید تا من لەی خاچە ڕزگارەو بووم.

- دڵشادی، نە؟

- ئەڵبەت ک دڵشادم.

هەر دگ دانە ژێر خەنینەو.

سارجنت وەت:

- کردمەی بڵخەیگ ها، مەر نە؟ کلیسا خاپۆر کردم!

- کار خاسێ کردی. دو هزار ساڵە ک کیشاننەسەمە خاچەو.
- ئووووو! سە بایە فرە دڵشاد بۆد ک لە شەڕێ ڕزگار بۆد.
- ئەی چە.
لە ناو وەفر چییانە نواوە. گرووبان وە پیای کوچگین تماشایگ کرد:
- وەڕاس دو هزار ساڵە هایدە ئەو بانە؟
- ئەرێ، باوڕ بکە.
- ئەگە پۆل داشتم چییایمن وەگەرد یەک گەردیایمن.
- خوەم گشت جییگ گەردیمە.
- ئەرێ، وەلێ فرە وەخت پێش.
- با وجوو ئێیە گشت جییگ گەردیمە.
لە نـاو وەفـر چینـە نـواوە تـا ڕەسـینە پەراوێـز ڕێهەسـەن . سارجنت شـەکەت بـۆ. شـەکەت و ئـەرەق کـردێ.
سارجنت لای ڕەیل قەتار وساد و وەت:
- ت چیدە کوورە؟
چەوێگ خستە مەسیهـ و درێژە دا:
- م ک ئاس و پاس و ئاوارەم. ت چە؟ ت چیدە کوو؟
- خودا زانێ، ئەمما لەیرە چم.
- م ک چمە هەر ئەورە ک خەفم.
- وەڕاس؟ مەر بوو؟
- ئەرێ دی. ئاخە ئەورە ک دەر نەیرێ.
دەیشـت شـار لـە پەراوێـز خاکرێـژ ڕێهەسـن، بووتەیـل و دارەیـل ڕۆت لـە نـاو وەفـر و تیەریکییا وە خوڵەکوویین چیان. لـە ناوەیـن دارسـانەیل، چارداخەیلێـگ لـە قوتـی و تەنکـە و چـوو و کـرواس هەڵـداون. ئـێ چارداخەیلـە لـە تیەریکیـا دیار نـەون، ئەمـا ئەگـە دەروەدەر بۆاتیایـد و وەگـەرد ورسـێیەیل و بێخانمانەیـل دەوران کەسـادی سـەر کـردۆن، ئێجـوو جییەیلێـگ ناسـیاید.
- م ک هەر لەیرە خەفم. شەکەتم.
مەسیهـ وەت:
- م توام خوەم برەسنمە کانزاس سیتی.
- باشە. وە ئمێد دیدار، وە سڵامەت!
لار بـۆ وەرەو ئاجـام بێخانمانەیـل و جـی خەوێـگ دییـەو. دی هۆچوەخـت مەسـیهـ وە چـەو نـەی. سـات شـەش شـەوەکی قەتارێـگ بـاری لـەورەو ڕەد بـۆا. سـارجنت وەگـەرد دە دوانـزە چەتـاڵ تـر لـە دارسـان دا دەیشـت، لـە ئنـاز ڕێهەسـەن دەوی و لـە قەتـار دارالـۆس وو بـۆ.
گوڵ سوو بۆ؛ گوڵ سوویگ سەرد و خوڵەکوویین.
وەگەرد خوەی وەت:
- یانـی مەسـیهـ ئیسـە هـا کـوو؟ هەتمـەن فـرە دۆرەو بـۆە. لـەی دارسـانە ک نەخەفـت.
قایـم چەوسـیاوە قەتـار تـا خـوەی بخەیـدە بـان واگـون ڕەژۆ ک لـە بـان چەرخەیـل قورسـێ، خـارا ناوۆە بیـاوان. ئەمـا وە سەرسـڕمانێگەو دی ک واگون پـڕ لـە پولیسـە. نزیکتریـن پولیـس وە باتـوم کوتـادە بـان بـەن کلگەیـل گرووبـان.
دنگ!
کوتادە بان کلگەیل سییەی ک چەوسیاونە لێو واگونەو.
دنگ!
ئەمـما گرووبـان دەس نیەکیشـیادەو. وە گشـت هـازەو چەوسـیاوە قەتـار و کووشـیا ک خـوەی بکیشـێدەو بـان. لەنـاخ قورگـەو نەڵـە کـرد:
- لانەتییەیل، بیلن بامە ناو واگون!

- دەنگد بوور، گەمژەی لێوە!
کوتادە بان بەن کلگێ و مشتێگ وەشانە ناو زگێ:
- ئێرە ک دارسان نییە. تو ناو قەتار نید. ناو زندانی.
دنگ!
دەسێگ وەشیادە مل کلگەیل سییەی ک چنگ خسۆنە میلەیل زندان.
دنگ!
دەسێگ لە ناوەین میلەیل پووڵایین وەشیادە مل قەڵەمێ.
لەنـاکاو سـارجنت ڕەسـییەو ک وەڕاسـی هـا لـە زنـدان، نـە نـاو قەتـار. خـۆن دۆەشـەو لـە بـان دەمچـەوێ هشـکەو بـۆ. سـەرێ وە شـددەت ژان کردیـا و پولیـس لـە دەیشـت زنـدان کوتیـادە بـان بـەن کلگەیلێیـەو، چوونکـە چەوسـیاوە قـەی میلەیـل زنـدان، هـاوار کردیـاد و دەر جمانیـاد.
گەمان کرد:
- هەتمـەن دۆەشـەو هاوردنەسـەمە ئێـرە، وەبوونـەی شـکانن ئـەو دەرە – دەر کلیسـا.
سـارجنت هەڵەوگـەردی و بـان نیمکـەت چوویـن، پشـت وە دیـوار سـەرد کوچگیـن چاتمـە دا. چووڵـتر لـە هەمیشـە بـۆ. دڵنگـێ تـەڕ بـۆ. تـەڕ و سـەرد و لیچـق و کەوشـەیلێ پـڕ لـە وەفـر و خـەرگ. نزیـک گـوڵ سـوو بـۆ و ئـەو پشـت دەر زنـدان کلگەیـل زامـارێ ماڵیـادەو.
کلگەیل زامار هن ئەو بۆ، ئەمما دەر نە.
کلگەیل هن ئەو بۆ، ئەمما باتوم نە.
سارجنت ک هەیکەڵێ لە زەمینەی دیوار زندانیش وەرەو سییاتی چییا، قیڕان:
- سەور کە. ئێ دەریشە شکنم.
پولیس وەت:
- دەنگد بوور! وەرنە دوارە کوتمەد.
هەیکەڵ چوارشانەی سارجنت بەرزەو بۆ. نەڵە کرد:
- ئێ دەریشە شکنم.
وەگەرد خوەی ویتە کرد:
- سـەرم سـڕ مەنێیـە مەسـیهـ چییەسـە کـوو؟ نیەزانـم ڕەسییەسـە کانـزاس سـیتی یـا نـە؟

---

**پاشکۆ:**

١- قەیران و کەسادی ئابووری ساڵەیل ١٩٣٠ لە ئەمریکا (Depressiom)
٢- موشەبەک
٣- سەلیب
٤- ئاستین
٥- بەردە
٦- ڕمیا
٧- ڕاهـ ئاهەن
٨- بێشە
٩- ئاویزان
١٠- ئەوەڵ شەوەکی
١١- زخاڵ سەنگ
١٢- خارا نان: تاختن

# گەنجایەتی بەفیڕۆدراو لە باشووری کوردستاندا

ڕێبوار سیوەیلی

## پێشەکی

من یەکەمجار لە ساڵانی هەشتای سەدەی بیستەمدا، وشەی (بەفیڕۆدان)م لە زانای عەرەب: (د. موستەفا حیجازی) بیست، کە لە کتێبێکی گەورەدا بەناوی (مرۆڤی بەفیڕۆدراو: شرۆڤەیەکی شیکارییانەی دەروونیی/کۆمەڵایەتی)، بەرچاوم کەوت. کتێبێک لە شێوەی بنکۆڵکارییەکی ورد و هەمەلایەندا ئەم دەستەواژەیە شییدەکاتەوە. خۆشبەختانە ساڵی ٢٠١٦ ئەم بەرهەمە بەنرخە لەلایەن وەرگێڕی بە توانا: سەلاح سەعدییەوە کراوەتە کوردی و ناوەندی ئاویەر بڵاویکردۆتەوە. ئەوسا یەکێک لە هاوڕێیان ئەو کتێبەیان پێناساندم، کە زۆریش لێیتێنەگەیشتم، بەڵام دوای گەڕانەوەم یەکەمین کورد بینیبێتم ئەم کتێبەی خوێندبێتەوە: د. محەمەد تەها حوسێن بوو، کە بەعەشقەوە باسی دەکرد. کتێبەکە ئەوەندە بەنرخە، وێڕای تێپەڕینی ساڵەکانیش هێشتا بایەخی خۆی لەدەستنەداوە و پێویستە ساڵانە بخوێندرێتەوە. ئەم وتارەی من لە پەراوێزی ئەو کتێبەدا بە بیرکردنەوەیەکی خۆمانەیی نووسراوە. وشەی گەنجایەتی، یان جەوانی و لاوێتی لە زارەکانی زمانی کوردیدا بەکاردێن. گەنج و گەنجۆ، لاو و لاوۆ، جەوان وشەی کوردیی ڕەسەنن و ئاماژەدە بە تەمەنێکی زووی تاکەکەس دەکەن، کە ئیتر هەرزە و منداڵ نییە. وشەکە لە کۆمەڵگەی کشتوکاڵیدا زیاتر لەبەر ئەوەی باشترین هێزی کارە ستاییش کراوە، لە کۆمەڵگەی جەنگدا لەبەر ئەوەی هێزی بەرەنگارییە و لە کۆمەڵگەی مۆدێرنیشدا لەبەر ئەوەی هێزی داناییە ستاییش کراوە. ڕوانگەی میتۆدی من لەم وتارەدا ڕەخنەیی و شیکارییە و سوودم لە فرەدیسپلینی وەرگرتووە. ئەمەش ڕێگەم دەدات لە شیکاریی و ڕاڤەکردنەکانمدا لە دیدێکی فەلسەفییەوە بۆ کۆمەڵناسی و مرۆڤناسی و دەروونشیکاری بپەڕمەوە بۆ ئەوەی مانا زۆترین ڕەهەندی خۆی بەدەستەوە بدات.



## بەشی یەکەم:

کافکا لە (نامەیەک بۆ باوکم)، ئاگۆستینی قەدیس لە (دانپیانانەکان)ی و حەکایەتیی (کوڕەکەچەڵە)، لە شوێنێکدا بەیەکتر دەگەن: بەفیڕۆدان، یان بەهەدەردان. کافکا باس لە مناڵیی و ترسیی لەباوک و ئەوەی لەو میانەیەدا لە تەمەنی ئەو بەفیڕۆچووە، دەکات. ئاگۆستین ئەوەی لە ماوەی لەبیرکردنی یەزداندا بەفیڕۆی داوە و بەسەریا تێپەڕیوە و وەک گوناه لەسەری حسابە، دەخاتە بەرباس. لە حەکایەتی کوڕەکەچەڵەشدا هاتووە، کاتێ کوڕە کەچەڵە و کچانی ئاوایی شەویان بەسەر دێت و ڕوودەکەنە ماڵێک، کە لە دوورەوە ڕووناکیی ئاگری تێدایە، بۆیان دەردەکەوێ ئەوە ماڵی خاتوو دێوە. شەو لەوێ دەخەون و تەنیا کوڕە کەچەڵە نەبێت، هەموویان خەویان لێدەکەوێت. کوڕە کەچەڵە نایەوێت هەل و کات بە خەوتنەوە بە فیڕۆ بدات. لەبەرامبەر ئەوەشدا پیرێژنەدێو دەنێرێت تا بە بێژنگ ئاوی بۆ بهێنێت، چونکە دەیەوێ بەهۆی دوورخستنەوەی دێوەکەوە و کاتبەفیڕۆدانی بە هۆی ئاوهێنان لە بێژنگدا، هەلی ڕاکردن و ڕزگاربوونی خۆی و هاوڕێکانی بۆ بڕەخسێ. بێژنگ بەهۆی ئەوەی کونکوونە ئاو گلناداتەوە! بەم پێیە بێت، هەندێجار بە فیڕۆدان لەدەرەوەی دەسەڵاتی ئێمە و بەهۆی دەسەڵاتگەلێکەوە لەسەرووەی خۆمانەوە ڕوودەدات. هەندێک جار مرۆڤ بۆخۆی بەفیڕۆ دەدات و باکی پێی نییە تا ڕۆژێک بەئاگا دێتەوە.. هەندێک جاریش بەفیڕۆدان وەک پێویستییەکی لێدێت و دەبێت وابکەین ڕوو بدات بۆ ئەوەی دەربازمان بێت. کافکا، ئاگۆستین و کوڕەکەچەڵە نموونەی ئەو سێ جۆرەی بەفیڕۆدانن.
ئاخۆ لە زمانی کوردییدا وشەکە چ مانایەکی هەبێت؟ بەفیڕۆدان بۆ دۆخێک بەکار دەهێنرێت کە مرۆڤ شتێکی هەبێت و هەر ئاوا ئاسان لەدەستی بدات و سوودی لێوەرنەگرێت. وەکئەوەی ئەو شتە فڕێ بدات، دووری بخاتەوە و.. لێرەشەوە نزیکی مانایی لە نێوان بەفیڕۆدان و فڕێداندا هەیە. هەموو بەفیڕۆدانێک بێفەڕکردنێکە، هێندە هەیە فڕێدان بۆ شتێکی بەرجەستەی مادیی بەکار دەهێنرێت و بەفیڕۆدان بۆ بەها و شتە مەعنەوییەکان.

هیچکەس ناتوانێت پێشبینیی بکات بەفیڕۆدان، بۆ نمونە کاتبەفیڕۆدان لە پێشەوە باشە، یان خراپ. کەس ناتوانێت

پێشبینی بکات ئەوەی کات بەفیرۆ دەدات، لە ڕاستیدا بەفیرۆدان بووە یان بەکارهێنانی کات.. بۆی هەیە بەفیرۆدان بە زیان و بە قازانج بکەوێتەوە. ئەوەی ئەو بڕیارە دەردەکات، بەفیرۆدان خۆی نییە، بەڵکو ئەو ئەنجامەیە کە لە بەفیرۆدانەوە دەکەوێتەوە. کەس ناتوانێ بڵێ هەموو جارێ کە چاوەڕوانیی خۆشەویستەکەمان کردووە و ئەو نەهاتووە، ئەمجارەشیان هەر نایەت، بۆیە چاوەڕوانیکردن بەفیرۆدانی کاتە.. کەس ناتوانێ بەدڵنیاییەوە بڵێ توانای نییە دوژمنایەتییەک بکوژێنێتەوە، هەرچەندە پێش ئەو کەسانیتر قسەیان تێدا کردووە بۆ کوژاندنەوەی. کەس ناتوانێت لەوە دڵنیابێت کە هەرچەندە خاوەن ئیرادەش بێت، شیاو نییە لە نەخۆشییەکەی چاکبێتەوە، هەرچەندە پزیشکەکان بەرێشییان کردبێت. چاوەڕوانیی خۆشەویست، هەوڵدان بۆ کوژاندنەوەی فیتنەییەک و ئیرادەی هەبوونی بەردەوامیی و پشت بەخۆبەستن، هیچیان بەفیرۆدانیان لێناکەوێتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا بەفیرۆدان وەکئەوەی کە هەیە، زیانمەند و مەترسیدارە، ئەمەش پەیوەندیی بەوەوە هەیە چییە ئەو شتەی بەفیرۆ دەدرێ..

زۆر شت هەیە لە ژیاندا بەفیرۆدەدرێ: هەڵکردنی گڵۆپێکی کارەبا و نەکوژاندنەوەی، یان کردنەوەی شێرە (بەلوعە) یەکی ئاو و نەگرتنەوەی، دەچنە خانەی کارەبا و ئاو بەفیرۆدانەوە. هەوڵدان بۆ وەستاندنی کەسێکی لەخۆڕازیی و کەللەرەق لە بڕیارێک، کە بەشێوەیەکی ڕەها خۆی بەڕاست دەزانێت، هەوڵدانێکی بە فیرۆدراوە. ژن و مێردێک کە هەموو ڕۆژێک ئاژاوە و شەڕیانە، تەمەنی خۆیان لەگەڵ یەکتردا بەفیرۆ دەدەن.. ئامۆژگاریکردنی کوڕێک، کە لە دایکەکەی دەدات بەتۆمەتی ئەوەی بۆچی ئەوی هێناوەتە دنیاوە، کات بەفیرۆدانە و دەبێت یەکسەر بنێردرێ بۆ لای دەروونناس، یان دووربخرێتەوە.. هەوڵدان بۆ دروستکردنی شتێک، بۆ نموونە: پردێک لەسەر ڕووبارێک، بەبێ ئەوەی کۆی ئامراز و کەرەستەکانیمان هەبێت، خانوویێک بەبێ ئەندازیارییەکی باش، دەوامکردن لە زانکۆیەک بەبێ خۆتەرخانکردن و حەز، دەستکردن بەشەڕێک بە بێ خۆئامادەکردنی پێشوەخت و هەبوونی سوپایەکی بەهەرەت، هەموویان دەچنە خانەی بەفیرۆدانەوە.

بەفیرۆدان، یان بەهەدەردان جۆرێکە لە خەسارەت و لەدەستدەرچوون، بەبێ ئەوەی لەکاتی بەفیرۆدانەکەدا بکەر هووشیار بێت. بکەری بەفیرۆدەر لەکاتی کارەکەیدا بیر لە ئەنجامەکەی ناکاتەوە، دەیکات و ئەنجامەکەی پێوەی دەدات لەگەڵ خۆیدا ژیانی کەسان و کۆمەڵگەیەکیش دەخاتە مەترسییەوە..

بە فیرۆدان لە بنەما و نەستی مرۆڤدا هەستێکی ئایینیی قووڵە لەبەرامبەر ژیاندا و ئەو هەڵەی یەزدان خستوێتیە بەردەستی بۆ ڕزگاربوون و دەرچوون لە تاقیکردنەوەکانی ژیان. لە ڕەگوڕیشەی بەفیرۆداندا، مرۆڤ ڕووبەڕووی ئەزموون و تەمەن و کات دەبێتەوە، وەختێ دەزانێ ئەو کاتەی بۆ ژیان لەبەردەستیدا بوو، ئەو ئەزموونانەی کەڵەکەی کردوون، هیچیان بۆ پەرینەوەو گەیشتن بە ژیانێکی بێکۆتای بەهەشتیی، سوودیان نییە.

لەرووی کۆمەڵایەتیی و دەروونییەوە، بەفیرۆدان ساتەوەختێکە مرۆڤ، یان تاکەکەس ڕووبەڕووی واقیعێک دەبێتەوە، کە هەست دەکات نەیتوانیوە ئەو هەنگاوە پێویست و بڕیارانە بدات، کە بۆ داهاتووی و هاوسەنگیی ژیانی پێویستن. یان ئەو هەلانەی لەدەستداون کە بەختەوەریان دەکرد. لە ڕووی فەلسەفییەوە، بەفیرۆدان ساتەوەختێکی بوونناسیانەیە، کە تیایدا مرۆڤ ڕووبەڕووی ئەو ئازارە دەبێتەوە، کە شتێک لە ژیانی ئەودا هەڵەیە و شتێک لەدەست دەرچووە و ئەوی بەرەو نەبوون، ڕاپێچکردووە و ئەمەش وایلێدەکات ژیان لەبەرچاویدا مانای خۆی لەدەست بدات.

بەمجۆرەش دەتوانین بڵێین: بەشێوەیەکی گشتیی بەفیرۆدان بەرەنجامی نەناسینی کات و ڕێزنەگرتنە لە دەسەڵاتی کات و تواناکانی خۆمان و ئەو ژینگەیەی تێیدا دەژین بە هەموو ئەو سوودانەی، کە دەشێیت لیی وەربگرین. نەبوونی هووشیاریی بکەرە بە زەبری زەمەن، بە دەوروبەر و ژینگە، بە وزەی تایبەتی مرۆیی و سرووشتی، کە وادەکات بەفیرۆدان ببێتە شێوازی ژیان و ناوەڕۆکێکی بێئەنجام بۆ کردەوەو بڕیارەکانی بدات.

ئەگەر لە ڕوانگەی نەزانیی و بێئاگاییەکەیەوە تەماشای بکەر بکەین، بە ئاشکرا دیارە ئەو بۆخۆی یەکەم کەسە دەبێتە قوربانیی، بەڵام ئەگەر لە ئەنجامی کار و بڕیارەکەیەوە تەماشای بکەین، دەبێت سنووری بۆ دابنرێ و ئاگادار بکرێتەوە. لێرەوە بۆ نموونە: تیژڕەوی لە هاتوچۆدا قەدەغەیە و سنووردار دەکرێت، نەک لەبەر ئەوەی تۆ ناتوانیت بە ئۆتۆمبیلی خۆت خێرا لێبخوڕیت، بەڵکو لەبەر ئەوەی تیژڕەوی، ژیانی کەسانیتریش دەخاتە مەترسییەوە.. بەفیرۆدان لەبەر ئەوە مەترسیدار نییە، چونکە تۆ دەتەوێ بە ئارەزووی خۆت بژیت، لەبەر ئەوە مەترسیدارە ئەگەر هەرکەسە بیەوێ ئەوە بکات، کە بۆخۆی ئارەزووی دەکات، ژیان و کۆمەڵگە هەڵدەوەشێنەوە.

گەنجایەتی جۆرێکە لە سامانی نەتەوەیی و کۆمەڵایەتی و لە بەهای مۆدێرن، کە هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ سامانە سرووشتیی و نەتەوەییەکانیتردا نییە، چونکە ئاستێکی هووشیاری مرۆڤە بە کات بەبێ لەبەرچاوگرتنی تەمەن. گەنجایەتی بەهایەکی مۆدێرن و نرخێکی کۆمەڵایەتی هەیە، چونکە پەیوەستە بە وزەی مرۆیی و ئابووریی مرۆییەوە، بۆ نوێبوونەوەی کۆمەڵگە لە ململانێکانیدا لەسەر ئەو شتانەی خەباتیان لە پێناودا دەکات و بۆ ئەمەش وزە و هێزی گەنجانەی پێویستە.

ڕاستە گەنجایەتی لە پلەی یەکەمدا پەیوەستە بە ژیانی تاکەکەس و تەمەن و وزەی خۆیەوە، بەڵام ئەگەر لەو ڕواگەیەوە تەماشامان کرد، کە گەنجایەتی سامانێکی نەتەوەیی و بەهایەکی کولتووری کۆمەڵگەیە، ئەوە پێویستە هەم کۆمەڵگە و هەم گەنجەکان لە دەستگرتن بەم سامانە هاوبەشەوە، هووشیار بکرێنەوە.

## بەشی دووەم:

لە ئێستادا زۆر نیشانە هەن، کە ئاشکرای دەکەن گەنجایەتی لە وڵاتی ئێمەدا چ لەلایەن گەنجان خۆیانەوە و چ لە لایەن کۆمەڵگە و سیاسەت و کولتوورە باڵادەستەکەیەوە، گەنجایەتییەکی بەفیڕۆدراوە. یەکێک لەو نیشانانە لەخۆتێکەیشتن و لەخۆنۆریی گەنجەکان خۆیانە، کە بێگومان لە هۆکارە کولتووری، کۆمەڵایەتییەکان و لەوانەش هۆکارە سیاسییە باڵادەستەکان لەم کۆمەڵگەیەدا، جیا ناکرێنەوە. لە خۆنۆری گەنجانی ئێمە و بچووککردنەوەی ژیانیان لە کولتووری تۆڕێکی کۆمەڵایەتی سادەدا، لە چەقبەستوویی فیکرییان، لە نەخوێندنەوەو کورتکردنەوەی هەموو شتێ لە گلەیی و تانە و هێرشکردنە سەر کەسانیتر و دان نەنان بە نەشارەزاییان، لە نەخوێندنیان، لە خوودانە پارە و مۆدێلپەرستی و بێبەزییان لە ئاست یەکتردا، لە بڕوابوونی ڕەهایان بە ئایین و کولتووری بنەماڵە و شارچێتی و ئینتیمای حزبیی و دەیان دیاردەی تردا، دەبینرێتەوە.

لە ئێستادا هەر تەنیا حزب و سیاسەت، چەقبەستوویی کۆمەڵایەتی و ژیانی بەرخۆری، عەقیدە و ڕەهاییگەری ئایینی، دانیشتن بەدیار لاییڤ و تۆڕی کۆمەڵایەتییەوە و دەیان هۆکاری دیکە، ژیانی گەنجەکانی ئێمە بە فیڕۆ نادەن، بەڵکو گەنجەکان بۆخۆشیان لەم بەفیڕۆدانەدا بەشدارن و خۆبەخشانە ژیانی خۆیان خستۆتە بەردەم بەفیڕۆدان. بۆیە هیچ کۆمەڵناسییەکی گەنجان بەبێ ڕەخنەگرتن لە گەنجان خۆیان مانای نییە. سەرەتای هەر کۆمەڵناسییەکی گەنجانە و هەر فەلسەفەیەک لەبارەی گەنجایەتییەوە، بە گەڕانەوەی بەردەوامی ڕەخنەگرانە بۆ ژیانی گەنجان خۆیان دێتە دی. کاتێک کۆمەڵناسیی و فەلسەفەیەکی کۆمەڵایەتی ئەوتۆ لە ڕەخنەگرتن لە کۆی ئەو هۆکارە کولتووری، سیاسی و سایکۆلۆژی، کۆمەڵایەتی و مێژووییانە دەبێتەوە، کە ژیانی گەنجەکان بەفیڕۆدەدەن، کاتێک ڕەخنە لە کۆی ئەو دامەزراوە حزبی و پەروەردەیی و ئەکادیمیانە دەگرین، کە تیایدا ژیان و وزەی گەنجانە بەفیڕۆ دەدرێت و هیچ حساب بۆ ئەم سامانە نەتەوەییە ناکرێت، ئەوە دەبێت بگەڕێینەوە بۆ وردبوونەوە لە گەنجان خۆیان و دەستنیشانکردنی ئەو هۆکارە خوودییانەی کە هەر گەنجان خۆیان دەیانگرنەبەر بۆ بەفیڕۆدانی گەنجایەتییەکەیان..

هەموو ئەمانە گەنجایەتی ئەوانیان ڕاپێچ کردۆتە ناو کۆمەڵێ ململانێ و کێشمەکێشەوە، کە هیچ سوودێکی ئەوتۆیان بۆخۆیان و کەسایەتیی و کۆمەڵگەکەشیان نییە. ئەم گەنجایەتییە گەنجایەتییەکی بەفیڕۆدراوە، چونکە کاتێ تۆ وەک گەنجێک هەڵگری کۆمەڵێ ڕێگریی دەروونیی و خودیی بیت بۆ فێربوون و بەتەواوی کە سایەتی خۆت خستبێتە ژێر سێبەری ئایدیۆلۆژیا، ئایین، کولتووری خێزان و عەشیرەت، یان هەر شتێکی ترەوە، بە قەناعەتی ڕەها گەیشتبیت و پێتوابێت لەودیو ئەو ڕاستیانەی ئایین و ئایدیۆلۆژیا و کولتووری لۆکاڵی پێت دەبەخشن، شتێکی تر بۆ فێربوون و زانین نییە، ئیدی مرۆڤێکی ئاسۆ تەسک و تەسکبینت لێدەردەچێت.

یاساکە ئەوەیە: هەرچەندە ئاسۆی بیرت لەسەر زانستەکانیتر، بیروڕاکانیتر، وڵاتانی تر و خەڵکانیتر، زیاتر و فراوانتر بێت، ئەمە نیشانەی خۆناسینێکی فراوان و شارەزاییە لەسەر وڵات و ئایین و کولتوور و خەڵکی خۆت. بە پێچەوانەشەوە، هەرچەندە شارەزاییت لەسەر ئەوانیتر و داب و دەستوور و ئەدەبیات و زانست و مێژوویان کەمتر و سنووردارتر بێت، ئەمە نیشانەی ئەوەیە تۆ لەبارەی وڵات و کولتوور و مێژووی کۆمەڵگەی خۆشتەوە دانایيت نییە، یان زۆر سنووردارە. ئەمەش ئەو ساتەوەختەیە، کە گەنجایەتی دەبێتە گەنجایەتییەکی بەفیڕۆدراو، چونکە گەنجان ئەو کارانە ناکەن و ئەو هەوڵانە نادەن کە ئەوان لە ڕووی هزریی و کولتوورییەوە، لە لۆکاڵگەرایی و ناوچەچێتییەوە، دەپەڕێنێتەوە بۆ جیهانگەرایی.

گەنجایەتی بەفیڕۆدراو، گەنجایەتییەکە بەهۆی داخران و بەندبوون لە کولتووری ناوچەیی و بنەماڵەیی و لۆکاڵی و ئەو ئایدیۆلۆژیایانەی لەم میانەیەدا باڵادەستن و بەردەوام کەسەکان ڕاپێچی ناو هەمان لۆکاڵیزم دەکەنەوە، خۆی خستۆتە پەراوێزەوە. گەنجایەتی لە پەراوێزدا، گەنجایەتییەکە پەیوەندخوازانە (Relation) نییە و تەنیا لە پێگەی (Position) خۆیەوە، لە شوێن و مەقامێک کە کۆمەڵگەی لۆکاڵیی بۆی دەستنیشانکردووە، تەماشای جیهان و بوون و ژیان دەکات.

ئەم نیگا سنووردارە، ئەم ژیانە بە حەرام و حەڵاڵیی سیاسیی و ئایینی و کۆمەڵایەتییە دەورە گیراوە، ئەم نیگا پڕ لە قەناعەت و یەقینە، گەنجایەتی دەکاتە وزەیەکی بەفیڕۆدراو. چونکە گەنجایەتی بەو هۆیەی کە سەرمایەیەکی کۆمەڵایەتیی و کولتووریی مۆدێرنی کۆمەڵگەکانە بۆ نوێبوونەوە، پێویستە هەمیشە لە چەقدا بێت و لە پەیوەندیدا بێت.

گەنجانی لەمجۆرەی ئێمە، کاتێ دەچنە ناو پەیوەندییە پەراوێزییەکانەوە، کاتێ لە پێگەی خۆیانەوە تەماشای جیهان دەکەن، لە ڕووی داناییەوە هەژار و دەستەوەستان دەبن. هەموو شتێ لەوەدا دەبیننەوە، کە خۆیان قەناعەتیان پێیەتی و خراوەتە دەروون و مێشکیانەوە. داناییەکی زانیاریمەندی لۆکاڵی و هەرەمەکی بەسەر بیرکردنەوەیاندا زاڵ دەبێت و ئەوان لە ژیانی گەنجانە و لە پەیوەندیخوازیی گەنجایەتی مەحرووم دەکات. ئەمە جگە لەوەی زانیارییەکان (ئینفەرمەیشن) دەبێتە ڕێگر لە بەردەم داناییدا (نۆلج).

لێرەشەوە، **ئەم جۆرە گەنجایەتییە کاتێ دەچێتە بواری خوێندنەوە، کاتێ دەچێتە ناو زانکۆکانەوە، بەهەمان بیروڕاو قەناعەتەوە دەچێت، کە هەیەتی و ئەمەش ڕێی لێدەگرێت، کە ببێتە کەسایەتیەکی خاوەن فرەیی لە دید و بۆچووندا و مرۆڤێکی تاکرەهەندی لێدەرچێت، کە لەهەر کاتێکدا بەرگریی لە وەرگرتنی شتی نوێ دەکات بۆ ئەوەی پارێزگاریی لە قەناعەتەکانی خۆی بکات.** لێرەشەوە، ئەوانە تەمەن و قۆناغی گەنجایەتی دەژین، بەڵام بەبێ کولتوور و دانایی گەنجایەتی و بەبێ چوونە ناو پەیوەندخوازیی گەنجانەوە.

کە ئەوان دەکاتە کەسایەتیەکی جیهانگەرا.
بەمجۆرەش، لۆکاڵیزم، بەناوی نەتەوەخوازیی، ئایینخوازیی، یان هەر فۆرمێکی دیکەی ئایدیۆلۆژی و سیاسی، سانسۆرێکی خراپە لەسەر گەنجان و گەنجایەتی ئەوان دەکاتە گەنجایەتیەکی بەفیڕۆدراو.
گەنجایەتی بەفیڕۆدراو، مرۆڤ بۆ چەوساندنەوەو فۆرمەکانی توندوتیژیی و بەرهەمهێنانەوەی نێرسالاری و ئایینسالاری و حزبسالاری، ئامادە دەکات. ئەمەش نەک هەر گەنجەکان لە گەنجایەتی خۆیان دابڕ دەکات، بەڵکو کۆمەڵگەش لە قۆناغی گەنجایەتی و وزە داهێنەرانەکەی گەنجان دابڕ دەکات و دەیکاتەوە مەکینەی بەرهەمهێنانەوەی ئەوەی کە هەبووە، نەک ئەوەی کە پێویستە هەبێت. بەمجۆرەش ئەم جۆرە کۆمەڵگەیانە، برەو بە سیستەم و تیۆرەگەلێکی پەروەردەیی دەدەن، کە خزمەت بە ئامانجەکانی خۆیان بکات. لەم سیستەمە پەروەردەییەدا، مرۆڤ لە خۆیدا وەکئەوەی کە هەیە، ئامانج نییە، بەڵکو ئامرازە. ئامرازی جێبەجێکردنی مەرامە سیاسی، ئایینی و ئایدیۆلۆژییەکانە لەسەر حسابی بەفیڕۆدانی گەنجایەتیی گەنجەکان.
ئەمجۆرە کۆمەڵگە و کولتوورە باڵادەستانەی وەکئەوەی ئێمە، **(من) لە کەسایەتی مرۆڤدا دەکوژن بۆ ئەوەی هەرگیز نەبێتە (خۆ)ی.** بۆیە هەموو هەوڵی مرۆڤ لەمجۆرە کۆمەڵگەیانەدا ئەوەیە لە میانەی تەمەنیدا جارێکیتر خۆی زیندوو بکاتەوە و ببێتەوە بە خۆی. هەندێک لەمەدا سەرکەوتوو دەبن و زۆربەش شکست دەهێنن. بەڵام ئەوەی کە زانراوە ئەوەیە، قۆناغی گەنجایەتیی باشترین وزەمان دەداتێ تا لە دەستی ئەو مەرگە کولتووریی و ئایدیۆلۆژی و سیاسیی و ئایینە بەسەرا سەپاوە رزگارمان ببێت و ببینەوە بە خودی خۆمان. چونکە بەبێ بوونەوە خود، لە لۆکاڵیزم رزگارمان نابێت و نابینە خاوەن دید و کەسایەتییەکی جیهانی. ئەمەش وادەکات گەنجایەتیمان بەردەوام لە نەبوونی هووشیارییەکدا بە خۆمان و بەو ئەرکانەی وەک گەنج لەسەر شانمانن، چ لە ئاست خودی خۆمان و چ لە ئاست کۆمەڵگەکەماندا، بەفیڕۆ بڕوات..
ئۆپۆزیسیۆن و دەسەڵات، حزبە ئیسلامیی و عەلمانیەکان، دامەزراوە دەمامک لە سەرەکانی وەک پەروەردە و زانکۆکان، راگەیاندنەکان و کایەی رۆشنبیریی، هەموویان لە دروستکردنی ئەو کەشوهەوایەدا بەشدارن، کە گەنجایەتی تیایدا بەفیڕۆدەدرێت. هەموو ئەوانە لە گووشین ومژینی وزەی گەنجەکان و بەلارێدابردنیان و سەرقاڵکردنیان بەو کارانەوە، کە خەونی گەنجانەی ئەوان ناهێنێتە دی، دروستکردنی کەشوهەوای بازرگانیی، بازاڕ و مۆڵ و مارکێت، هەموویان گەنجی لادەر و گەنجایەتیەکی بەفیڕۆدراو بەرهەم دەهێنن. لەم شوێنانەدا گەنجایەتی وەک هەر کاڵایەکیتر مەسرەف دەکرێ، دیسیپلین دەکرێ و یاساکانی بازاڕ، لە گەنجەکانی ئێمە بوونەوەرێک دەخوڵقێنێ، کە لە رووی دەروونییەوە ئامادەبێت بۆ هەر جۆرە ملکەچیی و ناچارییەک، هەر جۆرە ترس و هەرەشەیەک لەبەردەم خاوەن کار و ئەو موچەیەی دەیدرێتێ. بە لێشاو رۆژ تا ئێواریێ، لەشکرێ لە گەنجان و هەرزەکارانی وڵاتی ئێمە لەم شوێنانەدا بە ناوی کارەوە، دەچەوسێنرێنەوە و بڕی ئەو موچەیەی دەیاندرێتێ، لە سەدا یەکی خەونی گەنجانەی ئەوان ناهێنێتە دی.. ئەم شوێنانە بەو هەلومەرجانەی تێیاندا باڵادەستن، ناتوانن شوناسبەخش بن و ئەمەش وا دەکات گەنجانی ئێمە دووچاری بەتاڵیی و هەستکردن بە پووچیی ژیان و نائومێدی ببن. بە کورتییەکەی ئەو کەشەی گەنجانی ئێمەی تێدا دەژین، کەشێکی ژیاندۆستانە و ژیانویستانە نییە، بۆ ئەوەی گەنجەکان تووشی خۆراهێنان لەگەڵ ئەو کەشە سەپاوەدا نەبن، لەبەر ئەوەش کە ئاسۆی گۆڕینی ئەو کەشە بەشێوەیەکی بنەبڕ لە ئاسۆدا نییە، ئەوە پێویستە گوتارێک بەرهەم بهێنین، کە گەنجەکان وەک تاکەکەس رووبەرووی ژیانی خۆیان بکاتەوە. گوتارێک، کە هەر گەنجێک لەلای خۆیەوە کاری بۆ بکات و ئومێد بۆژیانی بگێڕێتەوە. گوتارێکی کردەیی و واقیعی، کە گەنج وا لێبکات بۆخۆی بەرپرسیارێتی ژیانی خۆی وەئەستۆ بگرێت و ژیانی خۆی بە هەند بگرێت..

## بەشی سێیەم:

کاتێک پێش چەند ساڵێک ئۆپۆزیسیۆن دروستبوو، ئێمەومانان ئەگەر نەشبووینە بەشێکی ئەوە دەستی خۆمان لە ئاست رەخنەکردنیدا راگرت تا خۆراک نەدەینە حزبە نەیارەکانی ئۆپۆزیسۆن، کەچی ئەوە هەر ئۆپۆزیسۆن خۆی بوو پەلاماری کەسایەتی و نووسەرانی دا. لە ئێستاشدا لە ئاست گەنجاندا دووچاری هەمان کێشە بووینەتەوە: نابێت رەخنەیان لێبگرین چونکە بۆی هەیە لە دژیان بەکار بهێنرێت. بەڵام ئەمە سیاسەتێکی هەڵەیە. نابێت گەنجەکان بەپیرۆز بکەین و بیانکەینە دیکتاتۆر چونکە دۆخێکی بابەتی و سیستەمێکی سیاسیی نالەبار و بێ پلان هەیە، کە بارودۆخی گەنجانەی بەم دۆخەی ئێستای گەیاندووە. هاوکات بەوەی پێویستە ئەو بارودۆخە و ئەم سیستەمە سیاسییە رەخنەی توندی لەسەر دۆخی گەنجانەی وڵات ئاراستە بکرێن، پێویستیشە ئەو گەنجایەتییەش رەخنەبکرێت کە بەدەستی خۆی گەنجایەتی بەرەو گەنجایەتییەکی بەفیڕۆدراو دەبات. ئەگەر بمەوێت لە ئێستادا، لە دەرەوەی خراپیی حزبەکان و نەبوونی پلانێکی تۆکمەی حوکوومەتەوە بۆ بەکارهێنانی وزەی گەنجەکان، بە دەر لەو هەلومەرجە ئابوورییە سەختەی کە گەنجایەتییەکی بەفیڕۆدراوی بەرهەمهێناوە، لە دەرەوەی گەمەی ئۆپۆزیسۆن و دەسەڵات، لە دەرەوەی هۆکارە بابەتییەکان و.. دوو رەهەند دەستنیشان بکەم کە بە هۆیەوە گەنجەکان زۆربەی وزەی خۆیان پەکخستووە. ئەو دوو رەهەندەش بریتین لە **یەکەم:** زاڵبوونی رۆحی ئۆپۆزیسۆنی لەناو گەنجەکان و **دووەم:** هەڵاتن لە دانایی و هووشیاربوونەوە.
ئەم دوو هۆکارە بە سەرەکیترین هۆکار دەزانم کە لە ئێستادا گەنجایەتییەکی بەفیڕۆدراوی بەرهەمهێناوە. هۆکاری یەکەمیان وایکردووە گەنجان تەنیا بەوەی ئۆپۆزیسۆن بن،

دژ بن، یان یاخی بن، ئەرکەکان لەکۆڵخۆیان بکەنەوە. کولتووری دژبوون و ئۆپۆزیسیۆن بوون ئەگەر هاوکاتیش بێت بە خۆ دروستکردن، زۆر گرنگە. بەڵام ئەزموونی پێشوو لە هەرێمی کوردستاندا ئاشکرای کرد، کە تەنیا ئۆپۆزیسیۆنبوون بەس نییە بۆ ئەوەی کۆی وزەی گەنجانە ئاراستە بکات و گەنجەکان لە کۆمەڵگەدا ئەرکی خۆیان جێبەجێ بکەن و کاریگەریی بەسەر کۆمەڵگە و جڤاتەوە دابنێن.. کولتووری ئۆپۆزیسۆنبوون وەک جۆرێک لە ئاکتیڤیتی، یان چالاکیی کاتییانەی تاکەکەسی لێهاتووە، کە تەنیا لە کاتی ڕووداوەکاندا هەڵوێستێکی شاشەیی یان مەیدانی وەربگرێت. بەمجۆرەش، ئۆپۆزیسیۆنبوون کولتوورێکی تەمبەڵخوازیی بۆ گەنجەکان دابینکردووە، بەجۆرێ بۆ هەر هەڵوێستێک کردەیەکی دژ و ئۆپۆزیسۆنی بنوێنن و کۆتایی پێبهێنن.

ئەم کولتوورە گەنجانی ئێمەی لە چاو گەنجانی وڵاتانی دراوسێ و جیهاندا، زۆر دوا خستووە. تەنانەت لەچاو گەنجانی بەشەکانیتری کوردستانیشدا. چونکە ئەو بزووتنەوە کولتوورییەی لە باکور و لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان بەرپابوو، بەدەگمەن لە هەرێمدا دووبارە بۆتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، گەنجایەتی بۆخۆی ئۆپۆزیسیۆنبوونێکی هەمیشەییە کە تاکەکەس تیایدا دژایەتی خۆی بۆ کولتوور و دەسەڵاتی باو لە ڕێگەی خۆدروستکردنی بەردەوامەوە، یاخیبوونی بەردەوامەوە، هەڵوێستی کردەیی بەردەوامەوە پەرە پێدەدات و ئەمەش هووشیاریی ئەو بەرز دەکاتەوە. ئۆپۆزیسیۆنبوون لە کۆمەڵگەی ئێمەدا هەرچەندە ئاکشن و چالاکیی و هەڵوێستی گەنجانی ئێمەی زیاتر کردووە، هەرچەندە کردوونی بە سوپایەکی هەڵوێستوەرگر، بەڵام بەو هۆیەوە کە هەموو شتێکی بۆ گەنجەکان لەمەدا کورتکردۆتەوە، ئەوە گەنجایەتییەکی بەفیڕۆدراویشی لە ناو ئۆپۆزیسۆن خۆیدا بۆ بەرهەمهێناون. گەنجایەتییەک، کە خەونی هەمیشە گۆڕانخوازیی و هەمیشە یاخیبوونی گەنجانەی بچووککردۆتەوە لە خۆجێکردنەوەی گەنجەکان لە نێو کولتووری ئۆپۆزیسیۆنبووندا.

بەمانایەکیتر، ئۆپۆزیسیۆنبوون کەشێکی وای ڕەخساندووە، کە گەنجەکان وا هەست بکەن تەنیا بەوەی ئۆپۆزیسۆن بن، ئیتر پێویستییان بە خۆدروستکردن و خۆهووشیارکردنەوە نەبێت. ڕۆحی ئۆپۆزیسۆنگەرایی و ئاکتیڤیزم، کولتووری قسەکردن و زارەگۆیی لەلای گەنجان بەرزکردۆتەوە، بەڵام بە ماڵئاواییکردنی گەنجانیش لە دانایی و هووشاریی تەواو بووە، کە ئەوان بەرەو شوناسێکی گەنجانە و گۆڕانخوازانە ئاراستە دەکات. بەستنەوەی گۆڕانخوازیی گەنجایەتی و وزەی گەنجانە بە کولتووری ئاکتیڤیزم و ئۆپۆزیسۆنگەراییەوە، سنووردانانە بۆ گەنجەکان تا لەو کەوشەنە ئۆپۆزیسۆنگەراییە تێپەڕ نەکەن. کێشەی هەرە گەورەش لەبەردەم ئەمەدا، ئەوەیە کە خودی ئەم ئۆپۆزیسۆنگەرایی و کولتووری ئاکتیڤیزمە، گەنجەکانی کردۆتە ئامراز بەبێ ئەوەی ئامانجێکیان بۆ دەستنیشان بکات.




ئامانجی ژیانێکی گەنجانە پێش هەموو شتێک ئامانجێکی کولتووریانە و ڕۆشنبیریانە و داناییانەیە. وەک لە بەشەکانیتریشدا نووسیم: مرۆڤ دەتوانێت گەنجایەتی خۆی لە ڕێگەی ئەو کولتوور و ڕۆشنبیرییەوە درێژ بکاتەوە، کە پەیڕەوی لێدەکات. لەسەردەمی بەعسدا گەنجان پتر لە هەرشتێک گەنجایەتی خۆیان لە ڕێگەی هووشیاربوونەوەیان دەسەلماند. ئینتیمان بۆ گەنجایەتی بۆخۆی دژخێکی ئۆپۆزیسۆنیانە بوو، کە خۆی لە هووشیاری و خۆڕۆشنبیرکردندا دەبینییەوە. ئۆپۆزیسۆنبوونی ئێستا و کولتووری ئاکتیڤیزم ڕێک هووشیاریی و ڕۆشنبیریی لە گەنجەکان سەندۆتەوە. **گەنجانی ئێستا پتر ڕواڵەتگەران و شوناسخواز نین. نە وەک ئەوەی پێویستە دەخوێنن و نە داناییشیان لە ئاستی خوێندنەکەیاندایە.** دنیای سیاسەت و حزبایەتی، ئینستاگرام، تیک تۆک، لایڤ و پۆپجی جیهانی ئەوانی داگیر کردووە و لە فێربوونی زمانی کوردی و پێنووسینی و دروستنووسینیشدا فرە لە پاشیانداوە. **هیچ ئۆپۆزیسیۆنێکم لە مێژوودا نەبینیوە لە گەنجەکان خۆفرۆش و جاسووس و دژە نەتەوەیی دروستبکات،** لە کاتێکدا بەشێکی ئەو پەرلەمانتارانەی بەغدا کە دژی بەرژەوەندییەکانی هەرێمی کوردستان کار دەکەن و داوای هاتنەوەی سوپای عێراقی داگیرکەر دەکەن، لە ناوهەناوی ئۆپۆزیسۆنەوە پەیدابوون.

لە ئاستی کولتوورییشدا، بە دەگمەن نووسینی گەنجێک، بە کوردییەکی دروست دەخوێنیتەوە. زمانەکانیتر هەر مەپرسە. بەرەنجامی تویژنەوەکان پێمان دەڵێن، کە گەنجانی ئێمە لە میدیاکانیشدا وەک بیرکەرەوە دەرناکەون و تەنیا لە ئاستی پرسیارکەر و پڕکردنەوەی دیمەنی بەرنامەکاندا دەردەکەون. تەماشاکردنی فیلمیش لەلای گەنجەکانی ئێمە زۆر پاشکەوتووە. تێگەیشتنیان لە جوگرافیای کوردستان، لە مێژووەکەی و تەنانەت لە دووژمنەکانیشی زۆر سنووردارە. چەند ساڵ لەمەوبەر مامۆستایەکی جوگرافیا لە پرسیاری تاقیکردنەوەدا داوای کردبوو هەر قوتابییەک ناوی پێنج شارەدێی بۆ بنووسێت. لە پاشاندا قوتابییەکان نارەزایەتیان دەربڕی کە ئەو پرسیارە لە مەنهەجدا نییە!

پێویستە ئێمە کارێکی پێچەوانە بکەین. دەگەڕێمەوە سەرەتای وتارەکەم کاتێک باسی کوڕەکەچەڵەم کرد: پێویستە لە ئێستادا، وەک کوڕەکەچەڵە بکەین: ئەو دانایانە دەستی بەسەر کاتدا گرت و نەیهێشت وەک نێچیرێک بیباتە بەردەم خاتوو دێو، بەڵکو بەو هووشیارییەی کە هەیبوو، مەترسییەکەی لەخۆی و هاوڕێکانی دوورخستەوە و خاتوونەدێوی خستە ناو بیرچوونەوە و ناهووشیارییەوە، تا کاتێک بەفیڕۆبدات لە هێنانی ئاو بە بێژنگ، کە ئیمکانی نییە. ئەم کاتە بۆ کوڕەکەچەڵە کاتی دەرفەت و کاتی زێڕین بوو. ئەو، ئەم کاتەی بە فیڕۆ نەدا و وەک ڕزگارکەرێک خۆی بەرجەستە کرد.. وەک براوەیەک کە توانای دروستکردنی داهاتووی هەیە..

پێویستە گەنجانی ئێمە بەرامبەر بە گەنجایەتی خۆیان هووشیار بکرێنەوە و ئاگاداربکرێنەوە لەوەی ئەوان وزە و سەرمایەیەکی نەتەوەیی و نیشتمانین. پێویستە پێیان بگوترێ ئێوە کوڕەکەچەڵەی ڕۆژگاری ئێمەن و هاوڕێکانتان گورگان خواردوو نەکەن، خەوتان لێبکەوێ دێوی بازاڕ دەتانخوا، وزەی خۆتان بە هەرزان و بێمەرج مەفرۆشن، چەندە خەریکی شێوەی خۆتانن، ئەوەندەش ناختان خۆراک و ڕۆحتان متمانەی پێویستە. **ئۆپۆزیسۆنگەرایی و کولتووری ئاکتیڤیزم جێگەی دانایی و خۆدروستکردنتان بۆ ناگرێتەوە.** بۆیە پێویستە هەر یەکەمان کوڕەکەچەڵەیەک لە ناخماندا پەروەردە بکەین، ئەو کاتە ئەو کولتوور و ئایین و سیاسەت و زانستە هەڵدەبژێرین، کە ناهێڵێت گەنجایەتیمان بە فیڕۆ بڕوات.

گەنجانی ئەمڕۆ لەبەردەم هەڕەشەدان، لەبەردەم فەرامۆشی و شێوەپەرستی و نومایشەکانی بازاڕ و ئیغرابوونی مادییدا. سیستەمی سیاسی ئێمە لەناو زەلکاوێکدایە، کە دەرباز بوون لێی وا ئاسان نییە. ڕەنگە مانەوەی ئەم سیستەمە بەمجۆرەی کە هەیە، لەبەرژەوەندی کەسدا نەبێت و هیچ سوودێکیشی بۆ داهاتوو نەبێت. بۆیە گەنجەکان زەرەرمەندی یەکەم دەبن، چونکە ئەوان وزە و هێزی کۆمەڵایەتی داهاتوون. بۆیە پێویستە فێری پرسیار و ڕەخنەی جدییان بکەین لەو سیاسەت و ئایدیۆلۆژیا و کولتوورەی زەمینەی بەفیڕۆدانی گەنجایەتی و وزەی ئەوانی دەستەبەر کردووە و وەک حەقیقەتی ژیان پێیان دەفرۆشێتەوە، لەکاتێکدا ئەوەی کە هەیە جگە لە چاوبەست و دەمامک هیچیتر نییە..



ئەگەر وەک وزە و سەرمایەی داهاتوو تەماشای گەنجایەتی و گەنجەکانمان کرد، پێویست ناکات لە ئێستادا بەرەو شۆڕش و هاندانی توندوتیژانە ئاراستەیان بکەین. چونکە ئەم کولتوورەی ئێستا باڵادەستە، کولتووری گەنجان و کەسایەتی ئەوانیشی شێواندووە. ئۆپۆزیسیۆنبوون وەک جۆرێ لە ئاکتیڤیزم پاشەکشەی کردووە و ناتوانێت هیچ شۆڕشێک بەرهەمبهێنێت. ئەگەر پێویستە شۆڕشێک ڕوو بدات، ئەوە گەرەکە لە دەروونی گەنجەکان خۆیاندا ئەو شۆڕشە بێتە ئاراوە و توانایی ئەوەیان هەبێت ئەم کولتوورە بازاڕیی و مەسرەفگەرایی و نومایشییەی سەرمایەدارییەتی مشەخۆری کوردستان ڕەتبکەنەوە. چوونی گەنجەکانی ئێستا بەرەوە داهاتوو بە هەمان کولتووریی داگیرکاریی و چاوبەستانەی گەنجایەتییەوە، بە هەمان ڕۆحی ئۆپۆزیسیۆنگەرایی و ئاکتیڤیزمەوە، داهاتووشیان وەک ئێستا بەفیڕۆ دەدات.

ئەم کولتوورەی ئێستا گەنجایەتی و گەنجەکانی داگیر کردووە، ئەو متمانەیەی پێناکرێت لە داهاتوودا گەنجانی ئێمە بەختەوەر بکات. ڕەتکردنەوەی ئەم دۆخی گەنجایەتییەی ئێستا و کولتووره هەڵوێستگرەکەی، هەنگاوی یەکەمە بۆ دامەزراندنی کولتوورێکی کراوە و نەتەوەیی بۆ گەنجەکان، کە لە پێش هەمووشتێکدا وڵاتی خۆیان خۆش بوێت و نیشتمان بکەنە شوێنی خۆ دروستکردن و شوناسدروستکردنیان. ئەو شتەی هیچ حزب و دامەزراوەیەکی ئەم وڵاتە نەیتوانی بۆ گەنجەکانی دروستبکات، پێوستە گەنجەکان خۆیان بۆخۆیانی دروستبکەن. یاخیبوونی یەکەم لەوێوە دەستپێدەکات، کە گەنجەکان هێز و توانای خۆیان لە ڕەتکردنەوەی ئەم کولتوورەدا تاقیبکەنەوە، کە کولتووری حزب و سیاسەت و ئایین و کۆنەپەرستی و سەرمایەدارییەت و ئۆپۆزیسۆنبوون و ئاکتیڤیزم هێناویەتییە ئاراوە و وەک قەفەسێک گەنجەکانی تێفڕێداوە. لەم کولتوورەدا گەنجایەتی

بەهای خۆی لەدەستداوە. ئەمە هەر ئەو کولتوورەشە، کە نیشتمانی لەبەرچاوی گەنجەکان ڕەش کردووە، لە کاتێکدا گەنجەکان خۆیان سەرمایەی سەرەکیی ئەم نیشتمانەن و هەر لێرەشەوە بەهای گەنجایەتی وەردەرگرن.

## کۆتایی:

وەک کۆتاییهێنان بەم زنجیرە وتارە، دەمەوێت بڵێم: **هەمیشە بۆ من گەنجایەتی جۆرێک لە چەپایەتی بووە.** پەیوەندییەکی پتەوم لە نێوانیاندا بەدی کردووە. وەکئەوەی هەموو کەسێک لە قۆناغی گەنجایەتیدا بە پێویستە چەپیش بێت. لێرەدا مەبەستم لە چەپبوون، بە مانا سیاسییە سنووردارەکەی نییە، بەڵکو بەمانا فیکرییەکەیەتی. هەر ئەم جۆرە بیرکردنەوەیەشە دەتوانێت هەمیشە گەنجایەتی لە بەفیرۆدان ڕزگار بکات. لەم ڕوانگەیەوە، لە گەنجایەتی مانا ئەقڵییەکەیی و لە چەپایەتی مانا ڕەخنەییەکەیم مەبەستە، وەکئەوەی ئەقڵی گەنجانە نەتوانێت لە دەرەوەی ڕەخنە و نوێگەری ئەقڵی، چارەنووسێکی دیکەی هەبێت. مرۆڤ وەک تاکەکەس هەم دەتوانێت گەنجانە و هەم چەپیانە بیر بکاتەوە بەبێ ئەوەی لە ئاستی تەمەندا گەنج و لە ڕەوتی ئایدیۆلۆژیدا چەپ بێت. لە دۆخی ئێمەدا، هەردووکیان بۆ دامەزراندنەوەی کوردبوون لە دەرەوەی «کوردایەتی» و مرۆڤبوون لە دەرەوەی «سیستەم» پێویستن، چونکە هەموو کوردبوونێک لەئەنجامی ڕەخنە لە کوردایەتی، بەرەو دروستکردنی ویژدانێکی نوێی مرۆییمان دەبات کە لە دەرەوەی سیستەمە دڵخۆشکەرە گەشبینکەرە، گەوجکەرەکەیە. بەم مانایە گەنجبوون وچەپبوون، ئەقڵ و ڕەخنە، دوو گەرانتین بۆ سەرکەوتنی هەر هەنگاوێک بەرەو دروستکردنەوەی کەسایەتی گەنجانە و مرۆڤانە و کوردیانەی شوناس. غیابی ئەم ڕەهەندانەش لە هەر پرۆسەیەکدا کە بیەوێت شوناسبەخش بێت ئامانجی پرۆسەکە دەخاتە مەترسییەوە، وەکچۆن گەنجایەتیش بەفیرۆ دەدات. پشتگوێخستنی گەنجایەتی و چەپایەتی بەو مانایەی باسمکردن لە پرۆسەی سیاسیدا جێگەی پێکەنینێکی نێشدارانەیە، بەڵام پەراوێزخستنی چەپەگەنجەکان تراژیدیا. بەفیرۆدانی سەرەکی لەوێوە دەستپێدەکات، کە گەنجایەتی لە ڕووی سیاسییەوە هیچ بەهایەکی نەمابێت و ڕوانگەی سیاسیی و حوکوومەت بۆ گەنجەکان بێ بایەخ بێت و تەنیا لەو گۆشەیەوە بیریان لێبکاتەوە کە زۆرترین ژمارەیان لێدامەزرێنێت! بەفیرۆدانێکیتر ئەوەیە، کە لە ڕووی کولتوورییەوە گەنجایەتی لە مانای خۆی بەتاڵکرابێتەوە و گەنجبوون کرابێتە قوربانیی کولتووری گەورەساڵی و ڕیشسپیگەرایی، بەفیرۆدانی سێیەم ئەوەیانە کە گەنجەکان بۆخۆیان نە ئەو پشتگوێخستنەی حوکوومەت و سیستەمەکە بەهەند وەربگرن و لە ئاستیدا هووشیار نەبن، نە بۆشیان گرنگ بێت کە گەنجایەتی کراوەتە قوربانییەکی بەردەوامی خواستی گرووپ و توێژەکانیتر.. لەوەش خراپتر ئەوەیە گەنجەکان خۆشیان دابێتە دەست هەردوو ئاستی بەفیرۆدانەکە و هەستی ڕەخنە و بەکارهێنانی هۆشیی خۆیانیان لەدەستدابێت.. ئەمە ئەو دۆخەیە کە هەنووکە گەنجایەتی و گەنجەکانی لە وڵاتی ئێمەدا تێدا دەژین.

٢٠٢٠/٢٠١٣





# چاچانێ ئێریڤانێ، خەمخۆرێ فلکلورێ کوردی

سەردار هێتوتی

## کورد ل ئەرمەنستانێ

ڕادیۆیا ئێریڤانێ وەک ناڤەندەکا مەزن یا کلتورێ کوردی ل ئەرمینیا و تەڤاهیا جیهانێ دهێتە دیتن و کوردان ب گشتی و ب تایبەت هونەرمەند و ئەدیب و سیاسەتڤانان ڕێیا ڤێ ڕادیۆیێ گرتبوو بەرخۆ و ژ بۆ خزمەتا ستران و فلکلورێ گەلێ خۆ ل هەمبەری مایکا ڤێ ڕادیۆیێ چەندین ستران و شانۆ و گۆتار تومارکینە، کومارا ئەرمەنستانا سوڤیەتێ (١٩٢٠/١١/٢٩) دەما هاتیە دانان، سەروکاتیا کۆمارێ بریار دا کو د ناڤا قوتابخانێن گوندێن کوردان دا زمانێ کوردی بهێتە خاندن و ژ بۆ ڤی کاری ژی پێدڤیا وان ب هەبوونا ئەلفۆبێیەکا زمانێ کوردی هەبوو، ل سالا ١٩٢١ لازۆ (هاکۆب خازاریان) ل سەر بنگەهێ تیپێن ئەرمەنی ئەلفۆبێیا زمانێ کوردی چێدکەت و ل هاڤینا هەمان سالٚ ئێکەم پەرتۆکا ب زمانێ کوردی ل سەر ئەلفۆبێیا ئەرمەنی دهێتە چاپکرن. ل سالا (١٩٢١) وێڤە گەلەک کومچڤین و کومبوونێن کوردان ل وی وەلاتی چێدبن. و ل گورەی سەرژمێریەکا ل سالا (١٩٢٢) هژمارا کوردان ل ئەرمەنستانێ دبیتە ٨٥٠٠ کەس کو پرانیا وان کوردێن ئێزیدی بوون.

## ڕەوشەنبیریا کوردی ل ئەرمەنستانێ

ل ڕێکەفتی (١٩٣٠/٣/٣١) ئێکەم ڕۆژناما کوردی ب ئەلفۆبێیا ئەرمەنی ب ناڤێ (ریا تەزە) دهێتە چاپکرن و وەشاندن و ل سالا (١٩٣١) ژ بۆ کو ماموستاییێن کورد هەبن کولیژەک بۆ پەروەردەهیا وان دهێتە ڤەکرن.
لێ ل سالێن (١٩٣٧-١٩٣٨) و پاشدا پێشڤەچوونا زمان و چاندا کوردی دهێتە ڕاوەستاندن و کولیژا پەروەردەهی یا کوردی و ڕۆژناما ریا تەزە و پشکا نڤیسکارێن کورد ل ناڤ ئێکەتیا نڤیسکارێن ئەرمەنستانێ و پروگرامێن کوردی یێن ڕادیۆیێ دهێنە گرتن و ئەڤ ڕەوشە یا بەردەوام بوو هەتا پشتی مرنا ستالینی.
لەورا پشتی مرنا جوزێف ستالین (١٨٧٨-١٩٥٣) کومیتا ناڤین یا پارتیا کومونیستا ئەرمەنستانێ، سێ بریارێن گرنگ د بەرژەوەندا کوردان دا پەسەند کرن کو ئەو ژی پێک دهاتن ژ ڤان خالان: سەر ژ نوو چاپکرنا ڕۆژناما ریا تازە ئەوا کو ل سالا (١٩٣٧) ژ وەشانێ ڕاوەستیایی. و ڤەکرنا پشکەکا کوردی د ڕادیۆیا ئەرمینیا دا کو ناڤەندا وێ ل ئێریڤانێ بیت و بابەتێ خاندنێ ب زمانێ دایکێ د دەستورێ وەلاتی دا.
ل دەستپێکا کاری د ڕادیۆیێ دا، کار یێ پری مورال و خۆشی و حەز بوو لەورا زێدە یا ب بەرهەم بوو لێ ئەڤێ یەکێ زێدە نەڤەکێشا و ئێدێ پێنگاڤ بەرەڤ لاوازبوونێ هاڤێتن.

## خەلیلێ چاچان کییە؟

خەلیلێ چاچان (١١ ژانیوەری ١٩٢٤- ١٣ نوڤێمبەرا ١٩٨١) دەما دبیتە ڕێڤەبەرێ ڕادیۆیێ، دوو سال ل سەر ژیێ ڤێ ڕادیۆیێ را دەرباس ببون و دەما ڤی ئەرکی دگریتە سەر ملان، ئێدی خەما وی دبیتە چاند و زمانێ کوردی و پاراستنا وی ل گشت سوڤیەتێ و ئەرمینیا و شیایە د دەما ٢٤ سالێن ڕێڤەبەریا خۆ دا پتر ١٤٠٠ سترانان ژ دەنگبێژێن کورد وەرگریت و بێخیتە سەر کاسێتێن تومارا دەنگی کو نوکە ئەو دەنگ د ناڤا ئەرشیفێ دەنگی یێ وەلاتێ ئەرمەنستانێ دا د پاراستینە.
ڕادیۆیا ئێریڤان ئەوا کو ب ڤی ناڤی د ناڤا جڤاتا کوردی دا دەنگڤەدای ڕادیۆیەک سەربخۆ نەبویە بەلکو پشکەک بۆ ژ ڕادیۆیا کومارا ئەرمەنستانێ کو سەر ب ئێکەتیا سوڤیەتا جاران بوو.
ئێریڤان کو ل ڕێکەفتی (١٦ شوباتا ١٩٥٥) وەک تێست دەست دایە وەشانێ بۆ جارا ئێکێ جاسمێ جەلیل دبیتە ڕێڤەبەرێ وێ، لێ پاشان دهێتە گوهارتن و خەلیلێ چاچان جهێ وی دگریت و هەتا دچیتە ڕەحمەتێ د وی ئەرکی دا بوو.
ژ بەر وان گوهرینێن کو د سیاسەتا سوڤیەتێ دا دهاتن ڤێ چەندێ کارتێکرن دکرە سەر پشکا کوردی یا ئێزگێ ئێریڤانێ ژی لەورا بۆ جارا ئێکێ پشکا کوردی ب تنێ ١٥ خۆلەکێن پەخشی هەبوون کو ئەو ژی د هەفتیەکێ دا ب تنێ چار ڕۆژا وەشانا ب زمانێ کوردی دهاتەکرن و ئەزنیڤا ڕەشید ژی بێژەر بوو، و پاشان ل سەردەمێ سەروکێ سوڤیەتێ (خرشۆف) دەمێ وەشانا کوردی د ڕادیۆیا ئێریڤانێ دا بۆ ٣٠ خۆلەکان زێدە دبیت و ل سالا (١٩٥٧) دەما کو مەلا مستەفا سەرکردێ گەلێ کورد سەرەدانا ئەرمەنستانێ دکەت و دگەل کاربدەستێن ڕادیۆیێ و ب تایبەت چاچان کومدبیت و داخازا وان دگەهینتە رایەدارێن موسکو و دەمێ ڕادیۆیێ ژ ١٥ خولەکان بۆ ٤٥ خولەکان زێدەتر لێدهێت.
چاچان ئەوێ کو گەلەک ب کێمی نڤیسەر و ڤەکولەرێن کورد خۆ ل دیرۆک و کار و خەباتا وی کریە خۆدان ئەڤرۆ پێدڤیە ب روحەکا کوردایەتیە کار ژ بۆ ڤەکولینێن مەزن ل سەر ڤی ڕۆژنامەڤانی و خەمخورێ پاراستنا چاند و کلتورێ کوردی بهێتە کرن.

# زاگرس در حصار بی‌تدبیری

محمد محمدنژاد

در دنیای امروز بدون شک یکی از عظیم ترین چالش‌های پیش‌روی جوامع انسانی از بین رفتن اکوسیستم‌ها و کاهش روز افزون تنوع زیستی است که یکی از این اکوسیستم‌ها جنگل‌های زاگرس است.

جنگل‌ها از جمله مهم‌ترین ثروت‌های طبیعی ایران هستند که هم اکنون با وسعتی به مراتب کمتر از چند دهه گذشته استقرار دارند. جنگل‌ها از جهات مختلفی مانند جلوگیری از آب‌های سطحی و تغذیه آب‌های زیر زمینی، تسویه هوا، جلوگیری از فرسایش، ذخیره‌گاه گونه‌های گیاهی دارویی و محیطی امن برای زیست جانوران، اهمیت ویژه‌ای دارند. پهنه‌ی رویشی زاگرس شامل رشته‌کوه‌های زاگرس، وسیع ترین و اصلی ترین رویشگاه گونه‌های مختلف بلوط در ایران بوده و به همین دلیل این منطقه از اهمیت بسیاری برخوردار است. این درختان نقش فوق العاده اکولوژیستی دارند و منابع مهم حفظ آب و خاک محسوب می‌شوند. با این وجود متاسفانه عده‌ای جنگل‌ها را محلی برای تغذیه چهارپایان و دام‌ها می پندارند. عده‌ای نیز جنگل‌ها و مراتع را به عنوان یک منبع اقتصادی می‌دانند که به وسیله کشت وکار یا بهره‌برداری‌های نادرست سود کلانی را برای آنان دارد.

ناحیه رویشی زاگرس از نظر وسعت تنوع زیستی یکی از مناطق مهم و با ارزش کشور به لحاظ حفاظت از منابع آب و خاک در اقتصاد ملی است. به دلیل استقرار سیستم‌های ناپایدار تولید و بهره‌برداری و ضریب بالای آسیب پذیری منابع طبیعی، روند فرسایش و تخریب محیط زیست در این ناحیه رویشی نگران کننده است و استمرار این روند تبعات منفی زیادی خواهد داشت. اکوسیستم‌های جنگلی با در نظر گرفتن غنای بیولوژیکی بالا از منابع مهم و حیاتی هر کشوری بوده و نقش مهمی در توسعه پایدار کشورها دارند که در میان منابع جنگلی کشور ناحیه رویشی زاگرس از مناطق مهم و با ارزش کشور می‌باشد که تاکنون مدیریت اعمال شده با اصول توسعه پایدار سازگاری نداشته و نتوانسته تاثیر چندانی در جلوگیری از روند تخریب این زیستگاه جنگلی داشته باشد.

پیامد بی توجهی به زاگرس نتیجه‌ای جز بیابانی شدن این جنگل‌ها ندارد. این منطقه سد عظیمی درمقابل بادهای گرم صحرای عربستان و مانعی برای هجوم ریزگردها است. زاگرس سپر غربی ایران است اگر دیر اقدام شود ضربه‌ای که از این ناحیه به کشور وارد می‌شود غیر قابل جبران است. پدیده بیابان‌زایی



که از ناحیه جنوب غربی کشور را تهدید می‌کند متاسفانه کل کشور را دربرخواهد گرفت. شاهد هجوم بادهای گرم صحرای عربستان به صورت گردشی از غرب به شرق و شمال کشور و درنهایت مرکز ایران خواهیم بود. زاگرس بیابان شود، ایران در ریزگرد غرق خواهد شد و آسیبی غیرقابل جبرانی به وجود خواهد آورد. جنگل‌های زاگرس وسعتی حدود ۶ میلیون هکتار دارد که بیش از دو هزار ۴۰۰ گونه گیاهی و جانوری در آن وجود دارد، متوسط بارش در آن حدود ۸۰۰ میلیمتر در سال است و بیش از ۵۰ درصد آب کشور را تامین می‌کند. هر هکتار جنگل پهن برگ می‌تواند سالانه تا ۲ هزار متر مکعب آب را در خاک نفوذ دهد و از هدر رفت آن جلوگیری کند، در حقیقت سرعت نفوذ آب در خاک جنگلی دست کم ۴۰ برابر خاک غیر جنگلی است. بنابراین حراست از رویشگاه‌های جنگلی به طور همزمان دو کارکرد مثبت دارد یکی اینکه سفره‌های زیرزمینی را پر می‌کند و دیگر اینکه با کاهش ضریب هرز آب، از جابجایی خاک و هدر رفت آب جلوگیری می‌شود. در سال‌های اخیر ساکنان مناطقی از جنگل‌های زاگرسی کشور که پیش‌تر با حفر چاه به عمق ۶ متر به آب دسترسی داشتند، اکنون ناچار به حفر چاه تا عمق ۶۰ متر برای دستیابی به آب شده‌اند و این یعنی کاهش سطح آب‌های زیر زمینی به علت نابودی تدریجی جنگل‌های زاگرس.

جنگل‌های زاگرس به دلیل اهمیت زیستی جنگل‌های حفاظتی هستند ولی در سال‌های اخیر به دلیل شعار زدگی و تمرکز بر توسعه ناپایدار تخریب گسترده‌ای بر پیکره جنگل‌های مناطق غرب و جنوب غرب ایران وارد و باعث از دست رفتن تعادل زاگرس شده است. مسئله این است که اگر تعادل طبیعت برهم نخورد، می‌تواند خود را احیا، پالایش و آفات و امراض را کنترل کند اما در زاگرس وضعیت به این شکل نیست و طبیعت جنگلی زاگرس قدرت خودپالایی را از دست داده و در حال نابودی کامل است که دلیل اصلی آن بهره‌کشی بی رویه و در نهایت بی‌توجهی به تحمل اکوسیستم زاگرس و عوامل انسان ساخت آن می باشد. زاگرس شریان اصلی کشور و منطقه است و مطمئناً نابودی آن بحرانی فرامنطقه‌ای محسوب می‌شود. برای نجات این شریان زندگی باید هر چه زودتر دست بکار شد و برای نجات زاگرس از این بحران باید دست به دامان دانش روز متخصصین و همچنین دانش بومی افراد محلی شد زیرا به سرانجام رساندن چنین اقداماتی بدون مشارکت جوامع محلی و بومی مطمئناً امکان پذیر نخواهد بود. به هرحال؛ برای صیانت از این پوشش همیشه سرسبز دیار زاگرس نشین که به عنوان نماد فرهنگ و آمیخته با زندگی روزمره است با فرهنگ سازی و آگاهی بخشی به مردم از خطر انقراض آن ممانعت بعمل آوریم و نگذاریم این رویه تخریبی در دستور کار فرصت طلبان و دشمنان زیست محیطی قرار گیرد که همانا باید در برابر امروز و آینده طبیعت و نسل های بعدی جواب گو باشیم.



## ئۆتۆریتەی «کورد» و بێ نەزمی جیهانی لە سەدەی بیست و مەرگ دا.....

عەبدولقادر نیازی

ئەوەندەی لە سەدەی ڕابردوو دا هێژمۆنی شەڕ و پێک دادان و لانیکەم بیرۆکە و دوکتۆرینی شەڕانگێزی هەبووە، ئەوەندەش کورد لەو هێژمۆنییە شوومە دا شتێکی هەبووە بۆ لە دەست دان.
ئەگەر چی کوژمەی(هزینە) شەڕ لە هەر وڵاتێک بە تایبەت لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا، هەمیشە داوێنی کوردیشی گرتۆتەوە، بەڵام دەکرێ بگوترێ ئەوەندەی هێژمۆنی شەڕ و پێک دادان لەسەر ئێپیستمەی کورد شوێن دانەر بووە، ئەوەندەش کورد لە بواری خۆناسینەوە زۆر جار سەرکەوتوو دەرکەوتووە.
دەکرێ بە بەرپرسایەتی تەواوە بکوترێ کە لە باری ئێپیستمۆلۆژییەوە، کورد یکێ لە سەرکەوتووترین قۆناخەکانی خۆی ئەگەر تێ نەپەڕاندبێ، بێ گومان لە کۆتاییەکانی نزیک بۆتەوە.
ئەوە سەرەڕای ئەو هەمووە نەهامەتی و وێرانگەری و خوێن ڕێژییە بوو کە خودی کورد لە گەڵ ئەوەی کە دە ژێئۆپۆلێتیکێکی تەواو وێران دا هەڵکەوتووە، ئەزموونی کردووە و بە ناحەق خوێنی لێ ئەستێندراوە.




بەشێک لەو ئەزموونە سەرکەوتووەی کورد سەرچاوەی لەو ئاشتی خوازییە گرتووە کە کورد بە درێژایی مێژووی خۆی هەیبووە. ئەگەر چی کورد لەو سەد ساڵەی دواییدا، زەبر و زەنگ و زەخت و گوشاری سیاسی زۆرینەی بە خۆیەوە دیت، بەڵام یک لەو فاکتۆرانەی کە ڕەگاژۆی دە سووژەی ئێپیستمیکی کورد دا کرد، ئەو هاوکێشییە سیاسی و کلتوورییە جیهانی و یۆنیڤێرساڵە بوو کە شان بە شانی مێژووی کورد ڕێگای شوناسی کوردی بڕیوە و سەر لە نوێ ڕێگای جیهانی بوونی بۆ هەموار کرد. ئەوە جودایە لەو هەمووە پێناسە سیاسی و ناسیاسیانەی کە تا ئێستا لە گلۆبالیزم کراوە.



وەک پێشتر ئاماژەی پێ کرا، ئەوەندەی شەڕ و پێک هەڵپڕژان لە ڕۆژهەڵاتی ناوین دا هەبوو، ئەوەندەش شوێن دانەرییەکی شوێن_ کاتی لە سەر کورد داناوە. بەختەوەرانە ئەوەی لەو نێوە دا زۆر باش چەسپا بە شوناسی کوردەوە، هەر ئەو لایەنی ئێپیستمەی کورد بوو. ئەوە لە کاتێک دایە کە ڕۆژهەڵاتی ناوین دەستێکی باڵای هەبووە لە شەڕ و پێک هەڵپڕژانی دەرەکی و ناوەکی دا و هەر ئەوەش بەشێکی زۆری لە مێژووی هاوچەرخی کورد بە خۆیەوە تەرخان کردووە.
ئەوەی دەو نێوە دا بە کورد سەلما ئەوە بوو کە بەشێکی زۆر لە مێژووی کورد، پەیوەست و پاشکۆی تەعامولی ئەو زلهێزانە بووە لە گەڵ ییێکتر، کە «مەعریفەی کورد»یشیان کردە قوربانی و نێچیری ئامانجە فاشیستییەکانی خۆیان.
جەمسەرەکەی تری ئەو هاوکێشەیە هەمیشە ئەوە بوو کە ئەوەی دەو ستراتژییەدا بۆ زلهێزەکان گرینگ بوو نە کورد بوون یا عەرەب بوون و تورک بوون کە ئەو کێش و قورساییە بووە کە نەتەوەیەک بە هەموو پرەنسیپە ئێپیستمۆلۆژییەکانییەوە دەیتوانی لە سەر بارودۆخ و هاوکێشەکان دا هەیبێ لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا. بێ ئەوەی نەتەوە پەرەستانە لە کورد بڕوانم، پێم وایە کورد لەو بارەوە هەمیشە شاز بووە و قورسایی ئەو تەرازووە هەمیشە بە لای ئەو دا بووە. واتا بارگراوەندی «کورد» لە ڕۆژهەڵاتی ناوین دا هەمیشە دیار بووە.
ڕکەبەرایەتی و مرۆڤ کوژی و سیاسەتی چەپەڵ و ئاژاوە نانەوە لە نێو جۆغرافیایەکی بێ سووژەدا، ئەوەندەی چەسپاندنی ئەنگی توند وتیژی و تیرۆرپەروەری لێ کەوتەوە، ئەوەندەشی شوێن دانا لە سەر سڕانەوەی شوناسی مرۆڤ لەو جۆغرافیا بێ سەر و بەرەیە دا. ئەوە لە کاتێک دایە کە سەرەکی ترین کەڵکەڵەی جیهانی لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمەوە تا ئێستا هەر ئەوەبووە کە لە ڕۆژهەڵاتی ناوین دا دەبیندرێ.
خسڵەت و تایبەتمەندی سەرەکی ئەو تیئۆریزەکردنەی شەڕ

و ژینۆسایدی شوناس و هۆویە لە ڕۆژهەڵاتی ناوین دا لە لایەن زلهێزەکانەوە، بە پێچەوانەی زۆر یەک لەو وڵاتانەی لە سەر نەقشەی جۆغرافیا و ئەرزی واقع دا خاوەن پرستیژێکی سیاسی و ئابووری و یا هارت و پوورتێک بوون، لە باری ئێپیستمۆلۆژییەوە نەیتوانی دەرەقەتی سووژەی «ئینسانی کورد» بێ. خاڵی بە هێزی کورد کە لە هەر شوێنێکی ناوچەی دووکەڵ و تەقەمەنی دا نیشتەجێ بووە ئەوە بووە کە لەو  بارودۆخە قەیراناوییەدا، بە دەگمەن وازی لە کوردبوونی خۆی هێناوە. بە واتایەکی تر دە ناخودئاگای ئەو کوردانەی دا کە سەر بە سیستەمە دژە کوردەکانیش بوون، جموجۆڵی ئارکی تایپی کوردی هەستی پێ کراوە.
ئەگەر چی سووژەی کورد لە زۆر لایەن و بواردا کەم و زۆر دەستی دە مێژووی خۆی دا گەڕاوە و لە سازدانی ئەو «شوێن _ کات»ـە سیاسییەدا کە تا ڕادەیەکی زۆریش نەزۆکە، ڕۆڵی هەبووە و تووشی زۆر قەیرانیش بووە.
باس لە ئێپیستەمەی کورد کە دەکرێ لێرە دا، هیچ کات بە مانای خۆ دزینەوە لە خوێندنەوەی خەسارناسانەی مێژووی سیاسی کەونارا و هاوچەرخی کورد نییە و بە ڕاشکاویش دەڵێم کە کورد قەرزدارترین قەرزداری مێژووی خۆیەتی.
سەرەڕای ئەوە کێشەکە ئەوەیە جیهان جیهانێکی شپرزە و ئاڵۆزە و ئەوەی سەردەمی ئێستا لە سەردەمەکانی پێش خۆی هاوێر دەکا هەر ئەو تێهەڵاندنە(تزریق) تیئۆریکەیە کە هێژمۆنی وڵاتانی زل هێز لە ناوچەدا دەیکەن و تێچووە مەعریفی و سیاسی و ئابوورییەکەشی دەکەوێتە سەرشانی ئەو گەلانەی کە قەزایەن هێژمۆنییەکیشیان ئەگەر لە ناوچەدا هەبێ ئەوەندە دیار و مەعنادار نییە. هەر بەم هۆیەشەوە دەکەونە ژێر هێژمۆنی ئەو ئۆریانتالیزمە سەقەتە کە دواتر وەک بەشێک لە مێژوو دەرخواردی نەتەوەکان دەدرێتەوە. کوردیش  بەش بە حاڵی خۆی لەو ئۆریانتالیزمە بێ بەش نەبووە و کەم و زۆر خەساری لێ وەرگرتووە لە بەر ئەوەی  کە کەلتووری لیبراڵی ڕۆژئاوا بەردەوام لە دەریچەی خۆیەوە لە نەتەوە ژێردەستەکانی ڕوانیوە. کوردیش لەو قاعیدەیە موستەسنا نەبووە.
ئەوەی لەو نێوەش دا بەردەوام کایەی پێ دەکرێ و بەردەوام وەک موتیڤێکی سەلبی و بێ بنچینە لێی دەڕواندرێ، هەر ئەو غیابی ئێپیستمۆلۆژییەیە کە تا ئێستا ئەگەرچی بارتەقای نەتەوەکانی تر دەست بە یەخەی کورد نەبووە بەڵام ئێستاش لە نێو زلهێزەکان دا



دەستاودەست دەگەڕێ بۆ لە ناوبردنی یکجاری.
ئەوە لە کاتێک دایە کە کورد سەرەڕای ئەوەش، هێشتا لەگەڵ گەلێک کێشەی ناوخۆیی و دەرەکی بەرەو ڕوویە، دەگەڕێتەوە سەر گەلێک فاکتەری جیهانی و ناوچەیی. بۆنموونە بەرتەسک کردنەوەی هێژمۆنی ئامریکا وەک زلهێزێکی نەڕۆخ، بۆ زۆر یەک لە وڵاتانی جیهان و ناوچە ئەگەر نالۆژیکی نەبێ بە یەقین دژوارە، ئەوەش بەو واتایە دێ کە ئێمە لەو ناوچە پڕ لە دووکەڵ و تەقەمەنییەی ڕۆژهەڵاتی ناوین دا، بە ناچار لە گەڵ سورگەیەکی مێژوویی(محورتاریخی) بەرەوڕووین، کە یا چاوەڕوانی هیچ ئاڵ و گۆڕێکی بنەڕەتی و بنیاتنەرانەی تێدا بەدی ناکرێ یا ئەگەر بشکرێ بە گوێرەی ئەو ئۆلگووە مێژووییە(زلهێز بوون و نەڕۆخ بوونی ئامریکا) بووە کە لانیکەم پتر لە سەدەیەک باڵی بە سەر دۆخی سیاسی و ئابووری ڕۆژهەڵاتی ناوین دا کێشاوە. سەرەکیترین کێشە لێرەدا ئەو سەر لێ شێواوییە ئێپیستمۆلۆژیکییە بووە کە بەختەوەرانە کورد بە پێچەوانەی دیکەی  نەتەوەکانی ناوچە بە باشی زەفەری پێ بردووە.
ئەگەر چی نکۆڵی لەوە ناکرێ  لە گەڵ ئەوەی کە دۆخی سیاسی کورد چ  لە کاتی دەوڵەت دارییەوە (کۆماری کوردستان لە مەهاباد)، چ لە ئێستا دا کە خاوەنی دەوڵەتی سەربەخۆ نییە، هیچ کات لە شوێن دانانی ئەو ئۆلگووە مێژووییەی ئامریکا بێ بەری نەبووە کە پێشتر ئاماژەی پێ کرا. بە واتایەکی تر کوردیش وەک زۆربەی نەتەوەکانی تر بۆتە قوربانی ئەو دوکتورینەی ئامریکا کە هەمیشە زەواڵ و غیاب و گۆشەگیری نەتەوەکانی تری مەبەست بووە.



ماوەتەوە بڵێم کە ئەو فاکتۆرەی  لەو نێوەدا هەمیشە شەڕی لە  ناوچەدا تێئۆریزە کردووە و بۆتە بەشێک لە ئێپیستەمەی مرۆڤی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، ئەو گۆشەگیری و ئنزوایەیە لە گۆشەی مێژووی سیاسی هاوچەرخ دا، و ئەو ترسە پۆزەتیڤ و ئیجابییەش کە کورد موجاب دەکا بە پاراستنی پرەنسیپەکانی«کوردبوون»، ئەو قەرائەتە ڕیئالیستییانەیە کە کورد لە مێژوو و ناسیۆنالیزم و ئێپیستەمەی خۆی دەبێ هەیبێ و خۆی سەر لە نوێ پێناسە کاتەوە بۆ ئەوەی زەفەر بە بەشێک لە مێژووی هاوچەرخی خۆی بەرێ کە لە زۆر لایەنەوە گەمارۆی داوە.



تاریکەو شەوە زەنگ
گەلە گورگ
دەوریان لێداوم
چرایەك ناسووتێ،
چرای دڵی خۆم نەبێ.
ڕوون ناکات تروسکەیەك
ڕێگەی بەر هەنگاوم!
سەگەوەڕە و لوورەی گورگ
کەوتوومە نێو بۆسەی چەند جەردەی بەتیارە!

یەکێ لەو بنارە
یەکێکیان لەم گردە
یەکێ تر لەو دۆڵە
یەکێ لەم کەنارە!
چرایەك ناسووتێ
باش ڕێگا نابینم
بەروانەی بێ ئۆقرەم
چەواشەی ئەوینم
گەلە گورگ

خێڵی سەگ
ڕێگەیان تەنیوم
دانیشم بە هیوای کام ناکەس
هەڵدەستم
خۆم ئەکەم بە ئاگر
مەرگ ئەکەم بە گەرای ژینی نوێ
وەك قەقنەس

جەلال مەلەکشا